چیرۆك

# زیندانێکی گەڕۆك

## چیرۆکێکی مێژوویی ڕووداوێکی واقیعیه

حەسەن پێنجوێنی

چاپی دووەم ١٤٢٨ك - ٢٠٠٧ز

چیرۆك

# زیندانیكی گەڕۆك

چیرۆكێكی مێژوویی و ڕووداوێكی واقیعیە

حسن محمد امین پێنجوێنی

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

کتێب : زیندانێکی گەڕۆك
نووسەر: حسن پێنجوێنی
ساڵی چاپ : ٢٠٠٧
نۆبەی چاپ: دووەم
ژمارەی سپاردن : ( ٢٦٤ ) ی ٢٠٠٧
تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە
چاپخانەی ( سیما )

## پێشەكی

"لۆدیدۆرف"[1] لە كتێبی "نەتەوە لە جەنگ " دا دەڵێت: "وە نەبێ لەم رۆژگارەدا جەنگی نوێ سوپا و هێزی سەربازی بێت و بەس.. بەڵكو بریتییە لە (جەنگی هەموان - حرب اجماعیە ) واتە: جەنگی نەتەوە لەگەڵ نەتەوەدا..

ئەم زانایە دەڵێت: (جەنگی هەموان) بریتییە لە: نەتەوە هەموو توانای عەقڵی و, ئەدەبی و ماددی خۆی, بكاتە خزمەتگوزاری جەنگ .

وە هەروەها ڕوونی كردۆتەوە كە: جەنگ دەبێ وەسیلەت بێت نەك ئامانج و مەبەست.. لەبەر ئەوە پێویستە هەموو تاك, تاكێكی نەتەوە ئامادە بكرێت بۆجەنگ وهەمیشە ئامادە و لەسەرپێ بن.

---

[1]- ناوی "ئیریك فۆن لۆدیندۆرف" ە لە ساڵی ١٨٦٥ ی زایینی لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٣٧ مردووە.. لە ساڵی ١٩١٤ سەرۆكی ئەركانی سوپای ئەڵمان بووە و یەكێك بووە لەوانەی سەرپەرشتی كاروباری جەنگی جیهانی یەكەمیان دەكرد.

"لۆدیندۆرف" لەبارەی (جەنگی هەموان)ەوە ئەم ڕا "ڕای" یانەی خۆی بلاو کردەوە . پێشەوا سەربازییەکان, کردیانە گاڵە و هەلهەلە, پێیوان وا بوو ئەو ڕایەی "لۆدیندۆرف" تازەیە و شیاوی ئەوەیە, وەك بیردۆزێکی سەربازی دابنرێ و پەیڕەو بکرێت !!

هەندێ لە دەوڵەتە گەورەکان بیرۆکە "فكرة"ی (جەنگی هەموان) یان جێبەجێ کرد, هەندێ لە بیرتیژان و زانایان لایان وابوو کە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و سۆڤیەت, یەکەم دەوڵەتێك بوون کە لە جەنگی جیهانی دووەمدا, ئەم بیرۆکەیان بەکار هێنابێت !!

بەلام ڕاستەقینە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیە, چونکە (جەنگی هەموان) زادەی سەدەی بیستەم نییە.. بەڵکو مێژوو دەگێڕێتەوە کە: چواردە سەدە لەمەپێش, لەسەر دەستی سوپای ڕزگاری خوازی ئیسلامدا بەکارهێنراوە.

هەرچی ووزەی ماددی و مەعنەوی و فیکری و بەشەری خۆیان بوو, کۆیان کردەوە, تا هەمووی بەرەو "تەبوك" ببەن لە ژێر ئالای "لا اله الا الله" دا,

دورگەی عەرەبی لە بت پەرستی و داگیرکەر, یا بە دەستەواژەیەکی تر لە کۆنەپەرستی و ئیستیعمار پاك بکەنەوە.. ئەمەش جێگەی شانازییە بۆ موسوڵمان کە: بەدی هێنەری ئەم بیرۆکە ناوازەیە بن لە هونەری جەنگدا و بیهێننە جیهانی واقیعەوە..

بێگومان سەرکەوتنی عەقیدەی ئیسلامی لە داهێنانی بیرۆکەی جەنگی هەموان دا تەنیا لەوەدا نەبوو, ئەم جەنگەی بەکارهێنا بۆ لەناوبردنی چەوساندنەوەی ستەم و نەفامی.. وە هەروەها نەیهێشت پاشەڵی ئەم بیرۆکەیە چەپەڵ ببێ..

بۆیە ئەم قسەیە دەکەین, چونکە لە سەدەی بیستەمدا, نەتەوەکانی تر لە بەکارهێنانی ئەم بیرۆکەیە لە جیهانی واقیع دا, ئەو سەرکەوتوویییەیان بەدەست نەهێنا کە ئیسلام بەدەستی هێنا, چونکە (جەنگی هەموان) لەسەدەی بیستەمدا, بەکارهێنرا بۆ داگیرکردن و دوژمنکاری خوێن مژین وچەوساندنەوە, وەك بینرا لە نازییەکان و فاشیستەکان... هتد .

لـە ڕاسـتیدا موسـوڵانان سـەرکەوتووبوون لـە: کۆکردنەوەی هەموو توانای خۆیان، وەك کەرەسەی گواستنەوە و جەنگ و چەك و زەخیرە . دەوڵەمەند و هـەژار چـی لـە توانایانـا بـوو پێـشکەشیان کـرد بێجگـە لـەوە، ئـەوەش مـە توانـای چـەك هـەڵگرتنی هـەبو، وەك جـەنگاوەرێك هاوبەشـی کـرد و چـەکی هـەڵگرت و تێکـڕا هاتنـە پێـشەوە.. تـەنیا سـێ کەسیان نەبێ.. وە ئەم کارەش بەم جۆرە، بۆ هیچ نەتەوەیەك ساز نەبووە و نەلواوە..

بەهـەر حـاڵ، ئـەم سـەرکەوتنە بـێ وێنەیـەی کـە ئیـسلام بەدەسـتی هێنـا لـە بـەکارهێنانی (جـەنگی هەموان) دا، وە نـەبێ نمـوونێکی هـەبێ لە چاو ئەو سزادانە پەروەردەییەی داینـا، بـۆ دواکـەوتووان لـەو جەنگـــەدا.. چـــونکە هــــەر وەك مێــــژوو بۆمــــان دەگێڕێتــەوە لــە جــەنگی جیهــانی دووەمــدا و لــە سەدەی بیستەمدا، چەندەها هـەزار خێـزان و منـداڵ و کـەس و کـاری دواکـەوتووان "مـتخلفین" بنـەبڕ کرن..

بەو پەڕی دڵرەقییەوە تەڕ و ووشك ئاگردرا، بوهۆی تاوانبارەوە بێ تاوان هەڵواسرا.. ئەم بێ بەزەییەش لەناو نەتەوە بەناو پێشکەوتووەکان لەسەدی بیستەمدا ڕوویدا !!

بەلاّم ئاینی پیرۆزی ئیسلام سزایەکی پەروەردەیی دانا بۆ ئەوانەی لە (جەنگی هەموان) دا دواکەوتن و درێغییان کرد..

ئەم سزایەش بۆ خزم و کەس و کاری تاوانبار نەبوو، تەنیا پەیوەندی بە تاوانبارەوەبوو بەس.. سزاکەش کوشتن و هەڵواسین و لە سێدارەدان نەبوو.. بەڵکو بریتی بوو لە پەروەردەکردنی گیانی و پاك کردنەوەی دڵ و دەروونی تاوانبار، تا بگەڕێتەوە ڕیزی کۆمەڵ، وە شیاوی پلەی بەرزی باوەڕ بێت، ئەو پلەبەرزەی کە هەموو موسوڵمانێك چاوی تێ بڕیوە..

ئەم چیرۆکە مێژووییەش باسی ئەو سزادانە بێ وێنە دەکات ; لەگەڵ بیر و باوەڕی پتەوی سزادراوێکدا لەوانەی دواکەوتن.. باسی ئەو زیندانە گەڕۆکە دەکات.. باسی ئەو قوتابخانە

پەروەردەییــە دەکــات.. هیــوادارم ســوودی بــۆ خوێنەرانی هاوزمانم هەبێت

١

نووسەر

١

# زیندانە گەڕۆکەکەم[1]

بۆ پەنجا ڕۆژ دەچێت لەم بەندینخانە سامناکە و لەم زیندانە گەڕۆکەدا تاڵترین تالاو دەچێژم.

دەبێ لەم زیندانە تەسك و تەنگەلاَنەدا بژیم.. ئەم زیندانەش کتومت بە ئەندازەی لەشم دروست کراوە.. لەم ماوەیەدا بەقەد ئەمڕۆ هەستم بە قورسی و گرانی ئەم ئازارەم نەکردووە.. ئەوەتە تەنگە نەفەسی کردووم !!

ئەم زیندانەی من, مرۆۋ ناتوانێ لێی دەرباز ببێت !! ئەوێکە زیاتر منی پەرۆش کردووە, بۆ هەرکوێ بچم لەگەڵمایە.. لەگەڵ ئەوەدا کە مل کەچمە و بێ گوێ پێم ناکات, زۆر قایمە و دەری دەرچوونم نییە !!

---

[1] - ئەم چیرۆکە وەرگێڕراوی: { الزنزانة المتجولة }یە بەهەندێك دەستکارییەوە..

باوەڕت هەبێ ئەگەر لەوە نەترسایە دەمرم و ئاسوودە دەبم, دەستی دەنایە بینم و هەناسەی لی دەبڕیم.. ڕیگەی هەناسەدانم دەدات تا بتوانم بەو ئازارەوە بژیم و لە چنگی ڕزگام نەبێ !!

ئای ئەوە چیمە؟! خۆ ناتوانم پێش دەمی خۆم ببینم.. پەردەیەکی ڕەش بیلبیلەی چاومی داپۆشیوە. ناتوانم هیچ ببینم.. دنیاش لەپێش چاوما دەسوڕێتەوە, با دەست بەو درەختەوە بگرم تا ڕاستیم بۆ دەرکەوێت. نەخێر, دەوروبەرم ناسوڕێتەوە بەڵکو خۆم سەرم سووڕ دەخوات !!

٢

بۆ ئەوەی بە تەواوی لە بەسەرهاتەکەم شارەزا بن و هۆی ئەم کلۆڵیەم بزانن, دەبێ سەرەتای بەسەرهاتەکەمتان بۆ بگێڕمەوە, کە ئەویش لە سی مانگ و بیست ڕۆژ لەمەو بەرەوە دەستی پی کردووە.

لەو کاتەدا وەرزی گەڕاوی گەرمای هاوین دەماودەمی ماڵ ئاوایی کردنی بوو, نزیك بوو پی بنێنە وەرزی پایزەوە.. بە تەواوی دیمەنەکەم لە

پـــێش چـــاوە کـــە چ هاوینێـــك بـــوو.. هێرشـــی پەیتاپەیتای گەرما و گڕە لەگەڵ بای "سـەموم" دا دەهات، ئەو بایەی لمی دەشت و بیابانی کردبووە پـشکۆیەکی ڕاخــراو، هەرشـتێکی لەسـەر بوایـە دەیبرژانـد.. بگـرە هەواکـەیش کـە بـەرز دەبـووەوە دەتگوت لە کوورەی ئاسنگەرەوە بەرز دەبێتەوە

ئەم هێرشە گەرمەی گـەرما، هاوکات بوو لەگەڵ میوەڕەسان و پێگەیشتنی خورمـا و بـەری هەنـدێ میـوەی تـر.. وەك ئـەوە یارمەتیـدەرێك بێـت بـۆ پێگەیشتنی بەروبووم..

منـــیش لەســـێبەری چـــڕ و پـــڕی باخەکـــەما دانیـشتبووم لـەو گەرمایـە بـەدوور بـووم.. خێـزانم دەوروبـەری ساباتەکەی ئاوڕشێن کردبوو، ئەمەش بوو بووە هۆی زیاتر فێنك بوونی جێگەکەم.. ئەگەر بای "سەموم" نەبوایە کە سنوری دەشکاند و خۆی دەگەیاندە ناو ئەو سێبەرە چڕوپڕەوە و ئەم لاو لای ڕوومەتی دەگەستم –تا یادم بخاتـەوە کـە لـە نـاو چ ناز و نیعمەتێکدا دەژیم و دوور لەو ئێش و ئازارەی

بەهۆی گەرماوە تووشی خەڵکی دەبێت- لەوانە بوو هەستم بە بوونی گەرما نەکردایە !!

چاووم گێڕا بە لق و پۆپی ئەو درەختانەدا کە هەوا دەیدان بە یەکدا.. بە دیمەنی ئەو دارخورمایانەی چووبوون بە ئاسمانا و هێشووی خورمایان شۆڕ کردبوویەوە، زۆر دڵخۆش و شادمان بووم... ئا لێردەدا سوپای موسوڵمانانم یاد کەوتەوە..

ئەو سوپایەی چەند ڕۆژێ لەمەو پێش ئۆردوگای "ثنیة الوداع" یان جێهێشت و بەرەو "تەبووك" کەوتنە ڕێ.. ژمارەیان لە چل هەزار کەس پتر بوو، بەرەو باکوور ئەو دەشت و بیابانەیان بڕی، بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو هەموو زەحمەتەی لە ئەنجامی بڕینی ئەو ڕێگا دوور و درێژ و بێ ئاو و گەرما سامناکەدا تووشیان دێت..

ئا لەم کاتەدا لایەنی چاکەی دەروونم پێی گوتم: کەعب، خۆ تۆ ئیمانت دابوو بە پێغەمبەر (ﷺ) پێناوی خوادا گیانت بەخت کەیت، وە لە خۆشی و ناخۆشیدا گوێ ڕایەڵ بیت.. چۆن دەتوانیت لەم

سـێبەرە چـڕ و پـڕەدا دانیـشیت؟! لەگـەڵ ئـەوەدا پێغەمبـەر و هاوەڵـەکانی بـەهۆی ئـەم گـڕە و گەرمایـەوە، ئێـستا لەوپـەڕی زەحمـەت و نارەحەتیدان؟! چۆن دڵت بڕوایـی دەدات تـۆ لێرەدا ئـاوی سـارد بخۆیتـەوە و پێغەمبـەر (ﷺ) و هاوەڵـەکانی ئاوی لێـڵ و سوێری بنکـی بیریـشیان دەست نەکەوێ بیخۆنەوە؟!

هـەروەك بیستبووم لـە تینواندا هـی وایان بووە ووشـترەکەی خـۆی سـەربڕیوە و عـەماری ئـاوی ناوسکەکەی دەرهێنـاوە، تـا بـەو ئاوە دەمێك تـەڕ کـات و ئـاگری بڵێـسە داری تینوویـەتی پـێ دامـرکێنێ، وە هەندێکیـشیان هەنـدێ لـە وورگـە تەڕەکەی لەسەر دڵی داناوە تا بەو تەڕییە ماوەیەك دوور بێ لە تینوویەتی !!

کـەعب و ئایا تـۆ چاتری لـە پێغەمبـەر (ﷺ) وە هاوەڵەکانی؟!!

ئینجا لایـەنی خراپـەی دەروونم بـە تووڕەییـەوە گـوتی: نـەدەبوا پێغەمبـەر پـێش دەسـتی بکـات، بـا ئەوان بهاتنایە و هێرشیان بکردایە.. بە تایبـەت کە

ئـەو دەیزانـی و لێـی ڕوون بـوو خـەڵکی تووشـی چ گرانـی و نـەهاتێك هاتوون !! خـەڵکی لێـرەش بـوون شتێکی وایان نەبوو بیخۆن..

ئەمە کەی کاری کردەیە لەم کاتی میوەڕەسان و پێگەیـشتنی بەرووبوومـەدا بـەرەو ڕووی دوژمـن بڕوات؟!

بۆ کوێیش؟! بۆ تـەبووك بۆ وولاّتـی شام، کـە بیـست ڕۆژ ڕێیـە بـە ڕۆیـشتنی حوشـتر. چ ڕێگایەکیش؟! بیابان، لماوی، گەرم، بێ ئاو، دوور لـە ئـاوەدانی !! هەرکـەس ئـەو ڕێیـە بگرێتـە بـەر تووشی زەحمەت و چەندەها دەردی سەر دەبێت !! زیـاد لـەوە تـا دەگەڕێتـەوە هـەموو بـەرووبوومی درەختـەکانی لـەناو دەچێت و دەوەرێـت... ئـاخر خـەڵکی وولاّخـی سـواری و زەخـیرە و توێـشوو لـە کوێ بێنن !؟

هێشتا لایەنی خراپـەی دەروونم، لـە قـسەکانی نـەبووبووەوە، کـە لایـەنی بـاوەڕو و چـاکە دەسـتی کـردە شـۆڕش و بـە تونـدی بەرپەرچـی قـسەکانی لایـەنی خراپـەی دایـەوە و گـوتی: بـڕو بیـانوو بـۆ

نەبوونی توێشوو و وولاّخ مەیەنەرەوە, چونکە لەم ڕۆژانەدا نەبێت تۆ هەرگیز دوو وولاّخت نەبووە, کەچی دەڵێیت: خەڵکی وولاّخ لە کوێ بێنێت؟.. لەگەڵ ئەوەد کە توانای باشت هەیە و لەناو ناز و نیعمەتا ڕادەبوێری, دەڵێیت: بۆ توێشووی ڕێگە خۆراك لە کوێ بێنم؟!

تۆ ڕاستییەکەی بڵێ ! ئەوەی تۆی دواخست, نەبوونی وولاّخ و زەخیرە نەبوو بەڵکو تەنیا بەهۆی خۆشەیستی ژیانی دنیاوە بوو

دووبارە لایەنی خراپەی دەروونم هەڵیدایە و گوتی: وا بڵێین: خۆم وولاّخم بۆ سواری هەبوو, خۆراکم بۆ توێشوو ئامادە بوو, ئەی ئەو خەڵکە لە کوێی بێنن؟ چۆنی پەیدا کەن؟ وا باشتر نەبوو بەرەنگاری دوژمن نەکرایە تا ئەو خەڵکە ئاوەها نەکەونە سەخڵەتییەوە و ئەو ماڵ و سامانەش کە بۆ ڕێکخستنی سوپاکە کۆ کرایەوە ئاوەها بە خۆڕایی نەڕوات؟!

لایەنی باوەڕ نەڕاندی بەسەریا و هاواری کرد و گوتی: هەی بێ ئاگا لە یادت چوو, عوسمانی

کوڕی عەففان سێصەد ووشتری بە جل و ڕەشمە و هەوسارەوە, لەگەڵ هەزار دینارا پێشکەش کرد بە پێغەمبەر (ﷺ)؟

یا لەوانەیە لە یادت چووبێ کە "عبدالرحمن ی کوڕی عەوف" صەد ئۆقیە [1] زێڕی پیشکەش کرد؟ وە ئافرەتانی موسوڵمان خشڵ و زێڕ و زیوی خۆیان پێشکەش کرد؟!

وابزانم لە یادت نەماوە کە "عمری کوڕی خطاب" نیوەی ماڵ و سامانەکەی هێنا و "ئەبوبەکری صدیق) یش چی ماڵ و سامانی هەبوو گسکی لێدا و هێنای بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)؟

لایەنی خراپەی دەروونم هەڵی دایەوە و گوتی: وا باشتر نەبوو پێغەمبەر (ﷺ) ئەو هەموو سامان و ماڵە پەرت و بلاو نەکاتەوە؟

لایەنی چاکەی دەروونم ڕاپەڕی و بە تووڕەییەوە گوتی: هەی ماڵ کاول, چۆن قسەی وا دەکەیت؟ خۆ

---

[1] - ئۆقیە بریتییە لە شەش یەکی نیو ڕتڵ واتە هەر ئۆقیەیەك دووصەد گرامە, بەو پێیە دەکاتە بیست کیلۆ.

پێغەمبەر (ﷺ)زۆری لەکەس نەکرد و هەرکەس بە ئـارەزووی خـۆی، چـەندی لـەتوانادا بـووبێ، یـا چەندی پێ خۆش بووبێ هێناویەتی.. ئەم کارەش بـووە هـۆی دەرخـستنی پلـەی ئیمـان و بـاوەڕی موسـولمانان.. وە ئـەم غەزایـەش بـووە هـۆی تاقیکدنەوەی باوەڕی باوەڕداران..

ئـەوە بـوو "عومـەری کـوڕی خطـاب " هەمیـشە هـەولی دەدا لـە کـاری خێـر و چـاکەدا پـێش "ئەبوبـەکری صـدیق " بکـەوێت.. کـە باسـی مـالْ پێش کەش کـردن کەوتـە ئارا "نـاو" وە، "عمـر" لە دلی خۆیا گوتی: ئەم ڕۆ پێش "ئەبوبـەکر" دەکـەوم دارایـی و ماڵەکـەی کـرد بـە دوو کەرتـەوە، کەرتێکیانی هێنایە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا "ئەبوبـەکر" یـش مـالْ و داراییەکـەی خـۆی هێنـا.. پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: (عومـەر، چـیت هێـشتۆتەوە بـۆ مـالْ و منداڵەکـەت؟ " عومـەر بـەو پەڕی شانازییەوە گوتی: چەندم هێناوە، ئەوەندەم بـۆ جێهێـشتوون ئینجا فـەرمووی بـە ئەبوبـەکر: "ئەی تۆ چیت هێشتۆتەوە بۆ مالْ و منداڵت؟، عەرز

کـرد: تـەنیا خـوا و پێغەمبـەری خـوام بـۆ جـی هێشتوون..

پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: جیاوازیتـان وەك جیاوازی ووشەکانتانە عومەر واقی وڕما و سەری ڕاوەشـاند وەك ئـەوە بڵـێ: هەوڵـدان بێـسوودە, هەرگیز بە تۆ ناگەم -ئەبوبەکر- !

پاشان لایەنی چاکە گوتی: هەی (کەعبی کوڕی مالیـك, ئەگـەر بـاوەڕی خـەڵکی بکێـشرێت, دەبـێ کێـشی باوەڕەکـەی تـۆ چیبێت؟! ئەگـەر بـاوەڕ لـە کـردەوەی چـاکەدا پیـشاندرێت, دەبـێ نمـوونی باوەڕەکـەی تـۆ چـیبێت؟! یـا دەتـەوێت وەك مونافیقـەکان بڕوبیـانووی پـڕ و پـووچ بێنیتـەوە؟! لایەنی خراپە هاتە جۆش و گوتی: نا, نا, نە ئەمە و نـە ئـەوە, ئەگـەر لـەم کاتـە گەرمایـەدا نەبوایـە هـیچ کـەس دوا نەدەکـەوت.. ئایـا وا باشـتر نـەبوو پێغەمبـەر ئـەم جەنگـەی دوا خـستایە بـوچ پـاش کۆکردنـەوەی داهـات و بـەر و بـووم و نـەمانی ئـەم گەرمایـە؟ خـۆ خۆیـشی دەیزانـی چـەند سـاڵێکە نـەبوونی و گرانـی و قـات و قـڕی میوانمـان بـووە و

خەڵکی پەرێشان بوون بۆ ئەم داهاتەی ئەم ساڵ.. وا چاتر نەبوو نەڕوات بوچ ئەو وولآتەی دوورەی شام بۆ بەرەنگاری کردنی دوژمن؟ بۆ چاوەڕوانی نەکرد؟ با دوژمن بهاتایە سەرمان، ئەو کاتە یەك هێرشمان بۆ دەبردن و قەلاچۆمان دەکردن !!

لایەنی باوەڕ لە دەرونما هاواری کرد و گوتی: بێ دەنگ بە، من وامزانی پیاوێکی هۆشیار و تێگەیشتوویت !! چۆن بەم جۆرە بەهەڵە بیر دەکەیتەوە؟! بۆچی نازانیت کە ڕۆیشتنی موسوڵمانان بۆ (تەبووك) دەبێتە هۆی ئەوە بیروباوەڕی ئیسلامی بە ئازادی و سەربەستی بلاو ببێتەوە؟ ئەی نازانیت ئەگەر پێش دەستیت کرد لە دوژمن، ئاگری نیازی شەڕ و دوژمنکاری لە دەروونیا خامۆش دەکەیت؟..

ئەمە لە لایەکەوزە.. لە لایەکی ترەوە ئەو هۆزە عەرەبانەی مل کەچی ڕۆمن دەوڵەتی ڕۆم هەوڵ دەدات بۆ بەرگری لە موسوڵمان بونیان، ئەم جەنگە ڕێگا خۆش دەکات بۆ موسوڵمان بونیان..

یا لەوانەیە نەزانیت؟ کە لە وولآتی شامەوە هەواڵ هاتووە: دەوڵەتی ڕۆم سوپایەکی زۆر و بێ ژمارەی کۆ کردۆتەوە و بەراییەکەی گەیشتۆتە (بەڵقا)..

باشە, ئەگەر سوپای ڕۆم کتوپڕ بێتە سەر شارەکەمان و لە ناکاوا بدات بەسەرماندا, ئایا ماوەی ئەوەمان دەبێت خۆمان ئامادە بکەین؟ دەتوانین بکەوینە خۆ؟ نە بەخوا, ئەو کاتە ڕەگ و ڕیشەی ئایینەکەمان دەردێنێ و ئافرەتەکانمان دەکاتە کەنیزەك و منداڵانیشمان بە کۆیلە, ماڵ و سامانیشمان بە تالآنی دەبات.. بەڵێ ئەو ماڵ و سامانەی تۆ خەفەتی بۆ دەخۆیت و لێی دەترسیت!!

بە ڕاستی بڕیاری پێغەمبەر (ﷺ) بڕیارێکی دروست بوو کە هێرشی بردە سەر دوژمن پێش ئەوەی دوژمن هێرش بێنێتە سەرمان, هەروەك دەڵێن لە ناو جەرگەی ماڵەکەیا هێرشی بێننە سەر ڕسوا دەبێت !!

بێگومـان ئـەم بیرۆکـە سـەربازییەی پێغەمبـەر (ﷺ)، لـە دەروونـی ڕۆمـدا کـاری خـۆی دەکـات و کاریگەری دەبێت، بۆ ترس خستنە دڵی دوژمنەوە وە نیـازی دوژمنکـاری لـە دڵـی دوژمنـدا خـامۆش دەکـات و وای لێـدەکات بیر لـەوە نەکاتـەوە هێـرش بێنێتە سەر موسوڵمانان

٣

شـەپۆلی هـالاّوی گـڕەی ئـەو ڕۆژە سـنووری سـێبەری شـکاند و دەم و چـاوی گەسـتم و لـەو خەیاڵ و بیرکردنەوەیەدا ڕاپچڵەکاندم..

بـەڵی، ڕاچـڵەکیم ئـاوڕێکم بـەم لاو لای خۆمـا دایـەوە و سوپاسـێکی زۆری پـەروەردگارم کـرد، کە ئەم باخ و سێبەر و ناز و نیعمەتەی پێ بەخشیوم

بانگم کردە خێزانم و گوتم: جێگەکەم بۆ ڕاخە، با سەروە نەوزێ بشکێنم.. چیم داوە لەم خەیالاّتە! بۆ مێشکی خۆمی پێوە ماندوو بکەم؟ شتێ هات ب خـەیاڵما زۆر دڵـم پێـی خـۆش بـوو، چـونکە شـوێنەوارێکی گـەورەی هـەبوو، بـۆ لابردنـی ئـەو

(مۆتەکە) یەی سوار بیر و هۆشم بووبوو خەوی لی زڕاندبووم..

بەم جۆرە قەناعەتم کرد بە خۆم و بە خۆمم دەگوت: ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ڕۆیشتوون، ئەوەندە زۆرن کەس ناتوانێ بیانژمێرێ، کەسیش نازانێت کێ ڕۆیشتووە و کێ جێماوە !! پێم وایە پێغەمبەریش (ﷺ) لەبەر زۆری خەڵکەکە، هەر نەزانێ کە نەڕۆیشتووم !!

٤

دەمەو ئێوارە بوو لەناو باخەکەدا هێشووە خورمایەکی تەڕ و تازەم بەدەستەوە بوو دەگەڕام. لە ناکاو گوێم لە دەنگی (جیددەی کوڕی قەیس) ەوە [١] بوو بانگی دەکردم، منیش وەڵامم دایەوە و فەرمووم لێکرد تا لەسەر سەکۆی ساباتەکە دانیشتێ، ئەو سەکۆیەم بۆ میوان دروست کردبوو،

---

١- دەگێڕنەوە ئەم (جد بن قیس) لە کۆتاییدا وازی لەمونافیقیەتی هێناوە و تۆبەیەکی چاك و پاکی کردووە.

پاش بەخێرهاتن و خۆش هاتن، گوتم: سەر عێلی (بەنی ساعیدە) هەواڵی؟ دەنگوباسی؟

وەلامی دامەوە – نیشانەی ڕق و تووڕەیی لە ڕواڵەتیا بەدی دەکرا – گوتی: جا، چ هەواڵێکم پێ بێت؟ تەنیا هەواڵ ئەوەیە: محمد هەموو گەنجەکانی بردین پێش ئەوەی بمرن تالأوی تیاچوونی کرد بە گەروویاندا !!

خۆمم لێ گێل کرد، چەند پرسیارێکی ترم لێکرد، تا واز لەم بابەتە بێنێ، بۆیە گوتم / سەر عەشرەتی (بەنی ساعیدە) ئێستا حاڵت چۆنە؟

بەلأم ئەو هەر لەسەر قسەی خۆی سوور بوو گوتی: ئەبێ پیاوێکی وەك من حاڵی چۆن بێ، بەدەست محەمەدەوە؟!

دەزانی محەمەد چی کرد بەو هەڵخەڵەتاو و سەر لێ شێواوانە؟ بەوەش وازی نەهێنا و دەست بەردار نەبوو، خۆی هەڵقوڵتاندە کاروباری ئێمەوە، ئێمەی سەرعێل و ڕەئیس عەشرەت !! ئەوەتە منداڵەکنیشمان لێ هان دەدات !!

ئـەم قـسەیەم زۆر پـێ سـەیر بـوو.. بۆیـە گـوتم: مەبەسـتت چییە؟ باوەڕت بـێ ئاگـام لـە هـیچ نییـە.. پێم بڵێ

گوتی بۆ چ نەت بیستووە (قەیس ) ی کوڕم چـی پێ کردم، کاتێ ویـستم بیـانوو بـۆ (محمـد) بێنمـەوە نەڕۆم لەگەڵیا؟!

گوتم: بۆ چ پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی دایت؟!

گـوتی: محمـد باسـی جـەنگی ڕۆمـی کـرد و پێـی ووتین: (دەتوانی لە جەنگی موزەردەکاند هاوبەشـی بکەیت؟

منیش وەڵامێکم دایەوە، تـا ئێستا فێڵـی وام بـۆ نەهاتووە !! پێم گـوت: پێغەمبـەری خـوا، ڕێم بـدە و گـیرۆدەم مەکـە، بـەخوا: خزمـان هـەموو دەمناسـن، هـیچ پیاوێـك بەقـەد مـن ئـافرەتی خـۆش ناوێـت و حـەزی لـێ ناکـات، دەترسـم ئەگـەر ئافرەتـانی ڕۆم ببینم، خۆم پێ نەگیرێ !!

گوتم: جا پێغەمبەر (ﷺ) بەم قسەیە ڕازی بوو؟!

گوتـی: سەرەتا پشتی تێکردم، بەڵام داخوازییەکەم

پەینا, پەیتا دووپات دەکردەوە, هەرچەند زۆریشی پێی ناخۆش بوو, ناچار بوو ئیزنم بدات !!

هەستم کرد ئەم پیاوە مونافیق و دووڕووە, بۆیە سێ و دووم لێ نەکرد و پێم گوت: ماڵ کاول, کەوابێ ئەم ئایەتە لەبارەی تۆوە هاتووە؟﴿ وَمِنْهُم من يَقُولُ ائْذَن لِّي وَلاَ تَفْتِنِّي أَلاَ فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُواْ وَإِنَّ جهَنَّم لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾ [1]

به خوا, جەناب ; ئەم ئایەتە لەگەڵ تۆدا کتومت یەکە !! ئەم قسەیەی من دای لە دڵی, بەڵام خۆی وا پیشان دا هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نییە.. گوتی: نا, نا, ئەو ئایەتە بەهۆی منەوە نەهاتووە ! چونکە محمد خۆی ڕێی دام.. هەناسەیەکی بۆ کڕوزاوی هەڵکێشا و گوتی: (عبدالله) ی کوڕیشم وا حاڵی

[1] - ئایەتی (٤٩) یە, لە سورەتی (التوبە) دا. وە ئەمەش مەعناکەیەتی: ( هی وا هەیە لە مونافیقەکان دێن بۆ لات و پێت دەڵێن: ئیزنم بدە با بمێنمەوە و نەیەم لەگەڵتانا, مەمخەرە ناو فیتنەوە و گیرۆدەم مەکە. ئەوانەی ئەم قسەیان کرد کەوتنە ناو فیتنەوە و گیرۆدەن. وە بێگومان دۆزەخ چواردەوری کافرانی گرتووە ولێی ڕزگار نابن.

بووبوو، وایدەزانی پەیوەندی بە منەوە هەیە بۆیە لە ڕووما هەڵچوو هات بە گڕما و سەرزەنشتی کردم و بە موونافیقی دادەنام !! بە داخەوە ئەوانەی ژیر و هۆشیارن تۆمەتی منافقیەتی دەردرێتە پاڵیان، کەس گوێ بۆ قسەیان ناگرێ !!

سەرێکی بادا و دەستی دەدا بە دەستیدا و دەیگوت: دەیانەوێ من واز بێنم لە قسەی ڕاست و دروست، ئەوەی کە ئەوان ناوی دەنێن موونافقیەتی!! ئەوان کاتێ واز لەم تۆمەتە دێنن، بڕۆم و وەك ئەو گەنجە چاو سوورانە خۆم بخەمە مەترسییەوە و خۆم بدەم بە کوشت !!

لای کردەوە بە لای منەوە و گوتی: توبیتو خوا، پێم بڵێ: ئاخر کەی عەرەب زاتی (جرأة) ی ئەوەی هەبووە لە بەرامبەر ڕۆمەوە خۆی ڕاگرێ؟ ئاخر عەرەب چۆن دەتوانێ هێرش بباتە سەر ڕۆم؟ ئەویش لە وڵاتی خۆیدا؟ کەی شتی وا هیچ عەرەبێك هەر بیریشی لێ کردۆتەوە؟

کوڕە، بە خوا: ئەمە کارێکی منداڵانەیە و نەدەبوا (محمد) بە گوێ ئەو هەرزەکارانەی

بکردایە!! برا، ئەوەتە پاشاکانی (غەساسینە) – کە عەرەب هێشتا پاشای وەك ئەوانی بە خۆیەوە نەدیوە– گەردنیان بۆ هێز و دەسەلأتی ڕۆم کەچ کردووە !!

ئینجا دەستی نا بە دەمی خۆیانەوە نەوە ترسی هەبێت یەکێك گوێی لە قسەکانی بێت، بۆیە بە ئەسپایی گوتی: سبەینێ هەواڵ دەبیستی، هێشتا ڕوون نەبووەتەوە ئەوانەی لە دەست ڕۆم ڕزگاریان بووە و هەڵهاتوون ژمارەیان چەندە؟!

باوەڕت هەبێ خەنجەرێك لەسەر دڵم بدرایە، چەندم ئێش پێ دەگەیشت، بەم دەستەواژە (عبارة)ی دوایی ئەوەندە ئازارم پێ گەیشت، بۆیە خۆمم پێ نەگیرا و هەڵچووم، نەڕاندم بەسەریا و گوتم: فرەبڵێ، لەوە زیاتر مەڕێسە !! دەتەوێ نەشەمەی خراپیان بۆ لێدەیت، دەتەوێ بە پڕ و پالأتنە سوپای ئیسلام تێ شکێنیت !!

زۆر بە خێرایی ئەوە هات بە دڵما کە: من چەند تاوانبارم لەم دواکەوتنەمدا !

خێرا هاتمەوە قسەکردن و گوتم: تەنیا ئەوە بەسە بۆ سەرشۆڕی و ڕسوایی ئێمە, کە لەو سوپایە دواکەوتین و لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) نەڕۆیشتین !! زۆر باش بزانە خوا نایشکێنێ و سەری دەخات..

بە دەنگێکی هێواشی گاڵتە ئامێز گوتی: ئەی لەوە ! ئەوە لەکەیەوە وا ئەوەندە بە حەماسەت بوویت؟! بۆچ تۆیش -وەك ئێمە- لە محمد و هاوڕێکانی خۆت دوانەخستووە؟! ئایا تۆیش -وەك ئێمە- بەر هەڕەشەی ئەم ئایەتە نەکەوتوویت:
﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللّهِ وَكَرِهُواْ أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَالُواْ لاَ تَنفِرُواْ فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ, فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلاً وَلْيَبْكُواْ كَثِيراً جَزَاء بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾[1]

---

[1] - ئایەتی ٨١, ٨٢ لە سوورەتی (التوبە). واتە: (ئەوانەی لە غەزای ﴿تەبووك﴾ دواکەوتن شادمان بوون بە دانیشتنیان لە مەدینەدا و بە نەڕۆیشتنیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا,

گوتم: بەڵێ، من دواکەوتم، بەڵام ئەم دواکەوتنەم مەبەست نەبوو، دەروونم زاڵ بوو بەسەرما.. ئەگەر لە بەر زۆری گەرماکە و ترسی بەروبومی باخەکەم نەبوایە کە وەختی ڕنینەوەی هاتبوو، وەڵاهی دوا نەدەکەوتم و لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەڕۆیشتم !! زۆریشم پێ خۆش بوو لەگەڵیان بوومایە بەڵام..

**گوتی: بەڵام چی؟ توخوا ئەگەر پێم نەڵێیت؟!**

گوتم: وام دەزانی دەتوانم بەرووبوومی باخەکە لەماوەی یەك دوو ڕۆژێکدا کۆ بکەمەوە و گەرماکەش نامێنێ و دەڕۆم بە شوێنیانا پێیان دەگەم..

داخ لە دڵیەتی و دەروون چەپەڵی خۆی دەرخست و گوتی: نا، نا، هۆی ئەوە نەبوو، بەلچکو

---

داخیان لێ دەهات و پێیان ناخۆش بوو بە ماڵ و بە گیان و لە ڕێی خوادا تێکۆشن. دەیانگوت: لەم گەرمایەدا نەڕۆن و لە جێی خۆتان دەرنەچن. ئەی محمد! بڵێ: ئەگەر تێبگەن، ئاگری دۆزەخ گەرمترە. لە پاداشتی ووتار و کرداری - ناڕەوایاندا -- با کەم پێ بکەنن و زۆر بگرین ) لە دۆزەخدا..

سێبەری چڕ و پڕت بۆ لوابوو, سامانێکی زۆرت لەبەردستا بوو, وە خۆشی دنیا پشت پێ چاتر بووە لەو بەڵێنەی "محمد" کە گوایە بەهەشت هەیە و خۆشە !! وا نییە کەعب گیان؟!

منیش کەمێ بێدەنگ بووم.. بەو خوایە خۆش بوو زەوییەکە بقڵیشێ و هەڵم لوشێ و ڕووی ئەم هەڵوێستە سەختە نەبم و ئاوەها ڕسوا نەبووومایا بەڵام خۆ زەوی شەقی نەبرد و منیش ڕۆنەچووم,

ئینجا گوتم: نەبەخوا, مەبەستم ئەمە نەبوو کە تۆ باست کرد چونکە من باوەڕم بە زیندوو بوونەوە هەیە و خۆشی بەهەشتم پێ چاتر تا خۆشی دنیا

وە ئەو ڕۆژەش "کە پێغەمبەر (ﷺ) موسوڵمانان کەوتنە خۆ ڕێکخستن, منیش خەریك بوو دەست پێ بکەم, کەچی گەڕامەوە و دەستم لە هیچ نەدا, لە دڵی خۆمدا دەم گوت: توانام هەیە و دەست بدەمە هەر شتێك ئامادەیە.. بەم پێیە خۆم خلافاند, هەتا هەموو لە خۆڕێکخستن بوونەوە و پێغەمبەر (ﷺ) و موسوڵمانان کەوتنە ڕێ و من هێشتا دەستم لە هیچ

نەدابوو، ئەڕۆیشتمەماڵەوە و لە خۆوە دەگەڕامەوە، بەو جۆرە هیچم نەکرد "

ئینجا کە ئەوان ڕۆیشتن، گوتم: خەڵی خۆیان پێچایەوە و پێشم کەوتن، ئێستاش ئەوان پێویستیان بە من نییە، دوو ڕۆژ، سێ ڕۆژی تر دەڕۆم و پێیان دەگەم، هەروەها تەمەڵیم کرد و خۆم ئامادە نەکرد، تەمبەڵی، لە دوای تەمبەڵی تا حاڵم بەم حاڵە گەیشت..

(ئەبو قەیس) گوتی: ئەوە چیتە؟ دەڵێی ئەم دواکەوتنەت پێ ناخۆشە؟ جا ئەگەر حاڵت وایە بۆ لە سەرەتاوە کاری خۆتت پتەو نەکرد؟

سەرێکم بادا و گوتم: شەیتان بە لەعنەت بێ، بە ماوەیەکی تر و ئەمڕۆ تا سبەی دواکەوتم، وە کاروانی باوەڕ کەوتەڕێ غەزا دەستی پێکرد، وا ئێستاش ئەوندە دوورە بە هیچ کلۆجێ نایگەمێ !!

(ئەبوو قەیس ) گوتی: ئێستاش شادمانی بە نەڕۆیشتنەکەت؟!

گوتم: ئەوە تۆ چ دەڵێیت؟ وەڵڵاهی نیازم بوو بڕۆم و پێیان بگەم و صەد بریا وام بکردایە.. بەڵام

وا دەردەکەوێت لە چارەما نەنوسرابێت, هەرچەند لە پێغەمبەر (ﷺ) دوا کەوتووم بەڵام هیوا دارم لە ڕیزی دواکەوتووەکاندا نەبم..

خۆزگا ! لە سەرەتاوە بمتوانییایە بڕیارێکی پتەوم بدایە و بەسەر شەیتاندا زاڵ ببومایە, تا ئەو پڕ و پاڵانتانەی ئەمڕۆ و سبەی دەیبیستم بەر گوێم نەکەوتایە..

(ئەبو قەیس) سەرنجێکی دام کە پڕبوو لە فرت و فێڵ ئینجا گوتی: نا, نا, (کەعب) گیان, من لێم ڕوونە ئەگەر لە گەڵیشیانا بڕۆیشتیتایە لە دەوروبەری (مەدینە)دا دەگەڕایتەوە و نە دەڕۆیشتی.. هەروەك بە شێ زۆری سوپاکە وایان کرد و لەگەڵ سەرۆك هۆزی (خەزرەج) دا گەڕانەوە, ئەوە بوو نیوەی سوپاکە نەبێ لەگەڵ (محمد) دا نەمایەوە !!

منیش زۆر ڕقم هەستا و گوتم: هەی دوژمنی خوا, وەڵڵاهی درۆ دەکەیت, ئەوانەی لەگەڵ (عبدالله کوڕی ئوبەی ) دا گەڕانەوە, تەنیا موونافیقەکان بوون لەگەڵ دڵ نەخۆشەکاندا.. ئەوانیش ژمارەیان

هەشتاوچەند کەسێ بوو, وە لە نەوەد کەس کەمتر بوون.. کە ڕۆیشتبوونە قەراخ شاریش تەنیا مەبەستیان ئەوە بوو, بە گەڕانەوەکەیان وورە بە موسولمانان بەردەن, ئەو چاتر کە نەڕۆیشتن و گەڕانەوە, چونکە ئەگەر لە ناو سوپاکەشدا بمانایەتەوە, دەبوونە هۆی شکاندنیان..

خۆزگا من لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دا بوومایە, جا بۆت ڕوون دەبووەوە کە ڕاستم دەکرد و ئەوپەڕی خۆگریم پیشان دەدا, وە پێم دەسەلماندیت کە خاوەن باوەڕ نابێ پشتی پێغەمبەر (ﷺ) لە تەنگانەدا چۆڵ بکات

بەلاّم (ئەبو قەیس) بە شەیتانی دەنگی هێواش کرد و گوتی: ئەم قسانەی تۆ زۆر دوورن لە ڕاستەقینەوە, ئەوە بوو (محمد) و هاوەڵەکانی ئۆردوگاکەیان لە نزیك (مەدینە) وە بوو لە "ثنیة الوداع" وە (عبدالله ی کوڕی ئوبەی )لە خوار ئەوانەوە لە کێوی (ذباب) بوو, کاتێ (محمد) ڕێکەوت (عبدالله ی کوڕی ئوبەی ) دوا کەوت و نەڕۆیشت, خەڵکیش دەڵێن ئەوانەی کە لەگەڵ

(عبدالله ) دا گەڕانەوە شتێكیان لەوانە كەمتر نەبوو, كە لەگەڵ (محمد) دا ڕۆیشتن

منیش تووڕە بووم و گوتم: ماڵ كاول, ئەوانەی لەگەڵ سەرۆكی مونافیقەكاندا گەڕانەوە, تەنیا دڵ نەخۆش و دوو ڕووەكان بوون كە هەموویان چڵكاو خۆری (عبدالله ی كوڕی ئوبەی ) ی هاوڕێت بوون, وە ژمارەیان نەدەگەیشتە نەوەد كەس..

بەڵام ئەوە بزانە خوا یارمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و موسوڵمانان دەدات و سەریان دەخات, بە كوێرایی چاوی ئەوانەی پێیان ناخۆشە !

٥

لە ناكاو دەمەقاڵەی نێوانمان وەستا, بە هۆی دەنگی (عبدالله ی كوڕی ئوبەی ) یەوە كە دەیگوت: كەعب, ئەوە تۆ لە كوێیت؟

گوتم: فەرموو, (كوڕی ئوبەی ) هات و سڵاوی كرد, لە تەنیشت (ئەبو قەیس) ەوە لەسەر سەكۆكە دانیشت, ئینجا گوتی: ئەرێ ئەو هەرا و هۆریایەتان چ بوو؟ وەك ئەوە ئاگاتان لە دەنگ و باسی ناوشاری (مەدینە) نەبێ؟

ئێمەش ڕوومان تێکرد و بەیەك دەنگ گوتمان: بۆ چ؟ چی ڕووی داوە؟ دەنگ وباس چییە؟

گوتی: بۆ چ نەتان بیستووە؟

گوتمان: چی؟

گوتی: هەواڵی (محمد) و هاوەڵەکانی.. ئەوانەی کە ڕۆیشتبوون پاشای ڕۆم تەمبێ بکەن !!

هەرەچەند لە قسەکانیەوە گاڵتە و لاقرتێ دەر دەکەوت, ویستم بزانم مەبەستی چییە؟ بۆیە گوتم: چی ڕوویداوە؟ دەی توخوا پێم بڵێ !!

بە دەنگێکی گرانی گڕ و ڕەش بینییەوە گوتی: نەگەیشتە خاکی شام, هەموو هاوەڵەکانی جێیان هێشت !! هێشتا ئاشی شەڕ نەکەوتۆتە گەڕ, هەموو ڕۆژێك دەستەیەك لە هاوەڵەکانی, ەل نیوی ڕێدا جێی دێڵن و دێن بۆ لای ئێمە.. پێم وایە پێش ئەوەی ڕووبەڕووی ڕۆم ببێتەوە, هیچ کەسی بە دەورا نامێنێ !!

بە توانجەوە گوتی: (محمد) بە گوێی پیاوە دنیا دیدەکان ناکات, هەر شوێن هەوا و هەوەسی گەنجەکان دەکەوێت !! دەبا بیخوات !!

ئەو ڕۆژە لە کێوی (ذباب) پێش ئەوەی محمد جێ بێڵین بە هاوەڵەکانی خۆمم گوت: (محمد) دەیەوێ لەگەڵ ڕۆمدا بجەنگێ، بەو هەموو: نەبوونی و گرانی و گەرما و ڕێگا دوورییەوە, جا ئەم کارەش لە توانای ئێمەدا نییە..

(کوڕی ئوبەی) درێژەی دا بە قسەکانی کە بۆنی ناپاکی و شەیتانی لێ دەهات و گوتی: ئەو ڕۆژە پێم گوتن: (محمد) وادەزانێ جەنگ لەگەڵ ڕۆم یاری منداڵانە !! بڕواتان هەبێ ئێستا هەموویان بە گوریس بەسراونەتەوە و جووڕەبابە دراون !!

(ئەبو قەیس) گوتی: ئەرێ وەڵلا.. ئاگام لێیە چەند پیاوێکی عاقڵ و تێگەیشتوو, لە ماڵی (سووەیلم) ی جولەکەدا کۆبوونتەوە, لەناو خۆیانا ئەنجامی ئەم جەنگەیان شیتەڵ کردووە.. ئێستاش قسەی ئەو پیاوە پیرە تێگەیشتووەی جەلەکە, لە گوێمدا دەزرنگێتەوە..

(کوڕی ئوبەی ) گوتی: چی گوت؟

(ئەبو قەیس) گوتی: ئامۆژگاری کردین و دەستە دامێنمان بوو گوتی: دەخیل صەد دەخیل, نەکەن

بە خەیاڵیش لەگەڵ ڕۆمدا بجەنگن !! بەڵام کێ گوێ دەگرێ بۆ قسەی ئەو پیاوە تێگەیشتووە؟!

پاش ئەوە گوتی: حیکمەت لە قسەکانیەوە دەباری کە دەیوت: (وا دەزانن جەنگین لەگەڵ ڕۆمدا, وەك شەڕی نێوان دوو عەشرەتی عەرەب وایە؟ )

(عبدالله) گوتی نەبەخوا, شەڕی ڕۆم وەك شەڕی عەرەب و عەرەب نییە.. ئەوان خاوەنی شارستانییەتێکی دێرینن و لە جەنگدا شارەزاییەکی باشیان هەیە و سوپایەکی بێ ژمار و مەشق پێ کراویان هەیە, عەرەب هەرگیز خۆی ناگرێ لە بەریانا !!

لە ماوەی ئەم قسانەدا من بێ دەنگ بووم و سەرنجی ئەم دوو زەلامەم دەدا و نەم دەزانی چیبکەم؟! لە ئەنجامدا نەڕاندم و گوتم ! وەڵلاهی: ئەم قسانەی ئێوە ئاوێنەی بالآنمای خۆتانە.. چونکە خۆتان لە دوورەوە زیرەتان کردوە و زراوتان تۆقیوە, وا دەزانن سوپای ئیسلامیش وەك

ئێوەن.. بە خەیاڵ وا دادەنێن: ئێستا هەموویان قەلاچۆ کرابن؟!

بەلاّم ڕق و کینە ئەوەی لە بیر بردوونەتەوە: موجاهیدێك کە مردنێك پێی خۆشتر بێ لە ژیانی دنیا -لە پێناوی خوادا- ئیتر چ دوژمنێك بەرگەی دەگرێ؟ بێ دەنگ بن، شوورەیی ناکەن دەڵێی بایەقووشن، ئەمڕۆ زۆر بێ پەردە نیازی چەپەڵ و حەشاردراوی دەروونتان دەرخست، جا نازانم کە پێغەمبەر (ﷺ) لەم غەزایە گەڕایەوە، دەدات لە گەردنتان و تەمبێتان دەکات؟ یا جارێکی تریش بە هیوای ئەوە بیر بکەنەوە و واز لە مونافیقیەتی بێنن مۆڵەتتان دەدات؟!!

(کوڕی ئوبەی) بەم تووڕە بوونەی من تووڕە نەبوو، بۆ ئەوەی هەڵچوونی من کەم کاتەوە، شێوەی ئاخاوتنەکەی گۆڕی و ئینجا گوتی: کەعب، گوێت لێ بێ با پێت بڵێم: ئەوانەی لە دەوروبەری (محمد) دا ماونەتەوە، ئەگەر لە (محمد) یان پرسی: ئەوە فلاّن دەست، چیان بەسەر هات؟ ئەویش بۆ

ئـەوەی دەوروبـەری چـۆڵ نەکـەن و جێـی نـەهێڵن، دەزانی چییان پیێ دەڵێت؟

چاوەڕوانی منی نەکرد وەڵامی بدەمەوە، گوتی: دەڵێـت: (ئەگـەر خێریـان تیـا بێـت ئـەوا خـو ئـەیان گەیەنێتە لاتان، ئەگەر بە جۆرێکی تریش بن و ئەوا خـــوا ئاســـوودەی کـــردوون و گـــییر نـــاخۆن بەدەستیانەوە ) !!

ئینجا قاقا دەستی کردە پێکەنین و گوتی: نازانم کـەی ئاسـوودە دەبێـت و هـیچ کەسـێکی بـە دەورا نامێنێت؟!

(ئەبو قـەیس ) بۆی سـەندەوە و گـوتی: دەزانـی لەم دواییەدا کێی تر لە محمد و هاوەڵەکانی خۆیـان دزیوەتەوە؟!

عبدالله گوتی: کێ؟

ئەبوقەی گوتی: ئەبو زەڕی غەفاری !!

عبدالله گوتی: چۆن بووە؟

(ئـــەبو قـــەیس) دەســـتێکی هێنـــا بـــە ڕیـــشە تەنکەکـەیا و گـوتی: ئـای چـەند پیـاوێکی زرنـگ و زیرەك بووە !! ئینجا شـانی دادا و گـوتی: ئـەبوزەڕ

زۆر بە عاقلانە خۆی دزیوەتەوە و وای پیشان داوە کە ووشترەکەی ناتوانێت بڕوات و پێی خستووە، گوایا بە ناوی ئەوەوە دانیشتووە تا ووشترەکەی شەکەتی و ماندوویی نەمێنێ و بنە و بارگەکەی چاك بکات، تا ئەوان جێیان هێشتووە، ئینجا بە خۆی و وولاخەکەیەوە گەڕاوەتەوە و گیانی خۆی دەرباز کردووە ، پێش ئەوەی کاتی دەربازبوونی لە کیس چێ !!

بەرامبەر بەم بوختانە گەورەی کە ئەم موونافیقە دروستی کرد بۆ ئەو هاوڵە دڵسۆزەی پێغەمبەر (ﷺ) خۆمم پێ نەگیرا، دەنگم بەرز کردەوە و گوتم: هەی دوژمنی خوا وەڵلاهی: درۆ دەکەیت، ئەبوزەڕ لەو پیاوانە نییە لە تەنگانەدا پشتی پێغەمبەر (ﷺ) چۆل بکات ئەبو زەڕ لەو موسوڵمانانەیە کە پەیمانی داوە بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مردن لە گەڵیا بێت..

بە لا قرتێیەکەوە گوتی: بەڵێ، بەڵێ، پەیمانی دا بۆ مردنیش لە گەڵیا بێت !! ئەی تۆ یەکێك نەبوویت لەوانەی لە (عەقەبە) دا پەیمانت بەست

لەگەڵیا و بەڵێنت پێدا لەگەڵیا بیت؟! بێجگە (بەدر) لە هەموو غەزاکانیشا بەشداریت لەگەڵا کرد وا ئەم ڕۆیش پشت تێ کردووە؟!!

گوتم: من لەم دواکەوتنەمدا عوزر و بیانوم هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەست دەکەم درێغیم کردووە، پێم خۆش بوو لەگەڵیان بڕۆشتمایە، هەرگیز جێم نەدەهێشت و گیانی خۆم دەکردە قوربانی ئەو..

(کوڕی ئوبەی) کە لە بارەی منەوە هیچی دەست نەکەوت هەندێ بیری کردەوە و گوتی: بابە، تۆ چ دەڵێیت؟ ئەوە نەبوو (هیلالی کوڕی ئومەییە) و (مەرارەی کوڕی ڕەبیع) لە غەزای بەدردا پەیمانیان دا تا مردن لەگەڵیا بن بۆ مردنیش؟ ئەی بۆ چی پشتیان تێکرد و نەڕۆیشتن لەگەڵیا؟

گوتم: بەڵێ، پەیمانیان دا بۆ مردنیش لەگەڵیا بن.. بەلاّم کێ دەڵێ ئەوانیش عوزرێکیان نەبووە و بەهۆی بیانوویەکەوە دوا نەکەوتوون؟ خۆ ئەوان زۆر باش ئاگایان لەم ئایەتەی قورئان هەیە کە دەفەرموێ:

﴿مَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفاً لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاء بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾[1]

درێژەم دا بە قسەكانم و گوتم: بڕوام وایە: هەركەس بەشداری كردبێت لە غەزای بەدردا, لە هیچ دوژمنێكی ئیسلام ناترسێت و هەرگیز پشت ناكاتە پێغەمبەر (ﷺ)

(ئەبو قەیس ) هەندێ وورده كۆكەی كرد و هەستایەوە و چوار مشقی لێی دانیشت و گوتی: باشە, تۆ پێت وا نییە (ابو خيثمة) سێبەری فێنك و ئاوی سارد و خواردنی باش و دوو ژنە جوانەكەی لە (محمد) پێ چاتر بووبێ؟

---

[1] – ئایەتی شانزەیە لە سوورەتی (الانفال) واتە: "لە ڕۆژی جەنگا هەركەس پشت هەڵكا و لە دەست دوژمن هەڵبێت – بۆ تاكتیك و زیان گەیاندنی باشتر بە دوژمن نەبێت, یا بۆ كۆمەكی كردن بە كۆمەڵێ موجاهید نەبێت, كە بیوەێت كەلینێك بگرێ – ئەوە ئەو هەڵهاتووە بەر غەزەبی خوا دەكەوێت و دۆزەخ جێگەیەتی و دۆزەخیش خراپترین جێگەیە "

گوتم: هەی دوژمنی خوا, تیرەکەت گەڕایەوە بۆ سەر دڵی خۆت, وادیارە خۆت کەڕ و کوێر کردووە نە قسەی حەق دەبیستی و نە واقیعیش دەبینیت, ئەگەر وا نەبوویتایە لە بارەی (ابو خیثمة) وە ئەم قسەیەت نەدەکرد.

(عبدالله) گوتی: چیت لە بارەی (ابو خیثمة) ەوە بیستووە؟!

منیش بەسەرهاتەکەیم لە سەرەتاوە بۆ گێڕانەوە و گوتم: دوێنێ (ابو خیثمة) ڕۆیشتبووەوە بۆ ماڵ.. هەر وەك دەزانن دوێنێ زۆر گەرم بوو کە دەبینێ وا خێزانەکانی, خۆیان ڕازاندووەتەوە و دەوروبەری ساباتەکەیان ئاوڕشێن کردووە تا زیاتر فێنك ببێتەوە و ئاوی سارد و خواردنی باشیان ئامادە کردووە, ئەم دیمەنەش مرۆڤ دڵخۆش و شادمان دەکات, ئا لەم کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) ی بیر دەکەوێتەوە, شادی لێ دەبێتە تاڵی و بە خۆی دەڵێ: باشە, پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو گڕە و گەرمایەدا بێت, بێ ئاوی سارد و بێ سێبەری فێنك, تۆیش لەم سێبەرە فێنکەدا و لە پەنای ئاوی

سارد و ئافرەتى جوانا بيت؟! بەخوا: ئەمە ويژدان نييە، ئينجا لا دەكاتەوە بەلاى خيزانەكانيەوە دەلێت: وەلّلاهى نايەمە ژێر ساباتى هيچكامتانەوە!! دەبى بگەم بە پيغەمبەرى خوا (ﷺ) توێشوى سەفەر و خواردنى پێويستم بۆ ئامادە بكەن، هەر لەبەر خۆرەكەدا دەوەستێت تا هەموو شتێكى بۆ ئامادە دەكەن، ئينجا وولاخەكەى دێنێتە دەرەوە و رم و شمشێرەكەى هەلدەگرێ، لە كاتى سواربوونا خواحافيزى لە مندالەكانى دەكات و بە گورجى غار دەدات تا سوپاى ئيسلام نەهاتۆتەوە پێيان بگات و شەرەف هاوبەشى كردنى دەست دەكەوێت..

(أبو خيثمة) ئەو پياوە بوو، كە ئيمان و باوەرەكەى نەيهێشت دانيشێ تا دەگات بە پێغەمبەر (ﷺ)، لەو بروايەدام چەند رۆژێكى تر بگاتە ناو سوپاى رزگارى خوازى ئيسلام..

(عبدالله) هەناسەيەكى ساردى هەلكێشا، ماوەيەك بێ دەنگ بوو وەك ئەوە بە شوێن شتێكا بگەرێ وورەم پێ بەربدا، ئينجا هاتە قسە و گوتى:

دەزانیـــت محمـــد و هاوەڵـــەکانی چـییان بەســـەر هاتووە؟ هەواڵمان پێ گەیشتووە کە: خواردنیان لێ بڕاوە بە سێ کەس دەنکە خورمایەکیان مژیوە تا لە برسـانا تیـا نەچـن, ئاویـان لـێ بـڕاوە لـە تاوانـا ووشـــترەکانیان ســـەربڕیوە و ئـــاوی ناوســـکی ووشترەکانیان خواردوتەوە !!

گـوتم: بـەڵێ, بیـستوومە زیـاتر لـەوەیش.. بـەڵام ئـەوە چ نەنگییـەکی تیایـە, مرۆڤی خاوەن باوەڕ لـە پێناوی خوادا ئەو ئازار و زەحمەتە بچێژێ؟

ئایـا ئـەوە بەڵگـە نییـە لـە سـەر شـکۆمەندی و گـەورەیی باوەڕیـان؟ (عبـدالله ی کـوڕی ئوبـەی ) کـە هیوا بڕاو بوو لێم و زانی ناتوانێ بەرەو کۆمەڵەکەی خـۆی ڕام بکێـشێ و توانایـشی نییـە قەناعـەتم پـێ بکـات, دەستی کـردە لاقرتـێ کـردن و تـوانج دان و گوتـی: بۆ (محمـد) داوا ناکات لە خواکەی ! تا ئەو ئـازار و زەحمەتـەیان لەســەر لابـەرێ و بـە فریـشتە دوژمنـــەکانی بـــۆ بـــشکێنێ و خـــەڵکی نـــەدا بـــە کوشت؟!

منیش گوتم: ئێ، ئێ! لە هەموو سەردەمێکا ئەوانەی باوەڕ لە دڵیانا جێگیر نەبووە و مونافیقن ئەم قسەیەی تۆ دەکەن، بەڵام با بە تۆ و ئەوانەی وەك تۆ وان بڵێم: خوا یارمەتیدانی خۆی بباڕێنێ بەسەریانا بێ ماندوو بوون سەرکەون..نەء، شتی وانیە لە ئیسلامدا..

دەبێ هەموو وەسیلەیەکی مادی بەکاربێنین بۆسەرکەوتن بەسەر دوژمندا،وە بۆ گەیشتن بەو مەبەستەئێش و ئازار بچێژن تاپلەی شەهیدبوون وخۆ بەخت کت کردن.ئەگەر موسڵمان هەموو ئیمکاناتی مادی خۆیان بەکارهێناو بەپێش کەش کردنی سەروماڵ ئامادەبوون و هەوڵیان داونەیان توانی دوژمن بشکێنن، ئەو کاتە یارمەتی خوایی دێت و سەربازانی نەبینراوی خوا خۆیان تێ دەگەیەنن و دەست بە کار دەبن.. ئێستا تێ گەیشتیت کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو دوعایە ناکات و ناپاڕێتەوە؟ هەرچەند ئەگەر ئەو داوایە بکات خوا بێ دڵی ناکات، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) داوای شتێك ناکات کە پێچەوانەی سوننەتی خوا بێت..

با منیش ئەم قسەیە بکەم: ئایا موعجیزە سوودی بۆ یەکێك هەیە، کە دڵ و دەروونی بە (نیفاق) وێران بووبێ؟! ئەگەر سوودی ببوایە، بێگومان تەنیا گەردیلەیەك (نیفاق) لە دڵ و دەروونتانا نەدەما !!

(جیدی کوڕی قەیس) لەم ماوەیەدا بێدەنگ بوو، گوێی ڕاگرتبوو، کە زامی دەمەقاڵەکەمان سوودی بۆ ئەوان نییە داوای کرد لە (عبدالله) هەستێ خۆیشی هەستا و پێکەوە ڕۆیشتن..

بەلاّم پێش ئەوەی دوور کەونەوە (عبدالله) هەڵوێستەیەکی کرد و گوتی: پێت وایە محمد سەرکەوێ؟! بەو ڕەش و ڕووت و برسی و تینوانەوە، کە وولاّخیان سوالّ کردووە و دەوڵەمەندەکان خۆراکیان بەرەو دۆزەخ بمبەن هەستان ڕۆیشتن..

پێت وایە (محمد) تەنیا خۆیشی بۆ ڕزگار بکرێ! ئەگەر تووشی بوو بە تووشی سوپای مەشق پێکراو و ڕێکخراوی ڕۆمەوە؟! ئەو سوپایەی کە: لە چەك و ژمارەی سەرباز و لێ زانینی هونەری

جەنگـــدا و لـــە هـــەموو ڕوویەکـــەوە لـــە محمـــد و سوپاکەی بالاّ دەست ترن؟!

قا, قا, دەستی کردە پێکەنین و بەرو ڕووم هات و دەمـی هێنایـە بنـاگوێم و بـە ئەسـپایی گـوتی: لەوانەیە نەیشت زانیبێت کە: پاشای ڕۆم مووچەی سـاڵێکی تـەواوی داوە بـە سـەربازەکانی, وە مـاڵ و سامانێکی باشی داوە بەو خێڵە عەرەبانـەی لـە ژێـر دەسەلاّتی ئەودان, تا هانیان بدات بۆ یارمەتی دانی سوپاکەی؟!

ئینجا هـەردوو مونافیقەکە بـە خۆبـایی بـوون و خۆبادانـــەوە ڕۆیـــشتن, لەوانەیـــە وا تێگەیـــشتبن ژەهرەکەیان کاریگەر بووبێت !!

٦

بـە تـەنیا لـە باخەکـەی خۆمـدا بـووم بـیرم لـەم جـەنگی تەبووکـە دەکـردەوە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) لەگەڵ موسوڵمانانا چووبوون بـۆی.. لەبـەر خۆمـەوە دەمگوت: تا ئێستا کـەس جەنگی وای نەبیستووە کـە: هـەموو ڕۆڵـە جـەنگاوەرەکانی هاوبەشـی تیـا

بکەن، بە مەرجێ خوا نەبێ کەس ئەنجامەکەشی نەزانێت !!

تا ئێستا هیچ نەتەوەیەك سەتاپای باشترین گەنج و ڕۆشنبیران و هۆشمەندانی خۆی بە جارێك بۆ جەنگ ببات

ئینجا خۆم بە خۆمم دەگوت: پێغەمبەر (ﷺ) ئەم جەنگەی بە جەنگی مان و نەمان داوەتە قەڵەم، دەیەوێت بەم جەنگە بیسەلمێنێ کە: ئیسلام هێزێکە و هەیە وەك گەورەترین کێو لە بەرامبەر هێزی لە خوا بێ خەبەران و ستەمکاراندا دەوەستێت، لووتی هەموو زاڵمێك دەشکێنێ و دەستی هەموو دەست درێژی کەرێك دەبڕێ..

بۆ ئەم جەنگە پیرۆزەی کە دەورەیێکی گەورەی هەیە لە داهاتوودا هەموو موسوڵمانێك ڕۆیشتووە و ئەوی خاوەن باوەڕی ڕاستەقینە بووبێ جێ نەماوە، مەگەر ئەوانەی کە زۆر پیر و پەك کەوتە و نەخۆشن یا مونافیقن.. باشە، من خۆم ناو بنێم چی؟ پیرم؟ نەء. نەخۆشم؟ نەء... مونافیقم؟ نەبەخوا.. ئەی

باشە من بۆ نەڕۆیشتم؟ ڕسوا و ڕەنجەڕۆ خۆم بۆچ دوا کەوتم؟!!

ئەوەتە خوا دەفەرمویْ:﴿ يا أَيُّهَا الَّذِين آمَنُواْ ما لَكُمْ إِذَا قِيل لَكُمُ انفِرُواْ فِي سبِيلِ اللّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الأَرْضِ أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ, إِلاَّ تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عذَابًا أَلِيمًا ويسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلاَ تَضُرُّوهُ شَيْئًا وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[1]

---

[1] - ئایەتی ٣٨ و ٣٩ لە سوورەتی (التوبە) یە. واتە ( ئەی ئەوانەی خاوەن باوەڕن! ئەوە چیتانە؟ کاتیْ پیْتان گوترا: دەرچن بۆ جیهاد لە ڕیْی خودا, خۆتان قورس کرد بە زەوییەوە و تەمەڵیتان پیشان دا؟! ئایا ڕازی بوون بە ژیانی دنیا لە جیاتی ژیانی قیامەت؟ ڕابواردنی ژیانی دنیا لە چاو پاشە ڕۆژدا هەر زۆر کەم و بیْ نموونە..

ئەگەر دەر نەچن بۆ جیهاد, خوا سزایەکی بە سویْتان دەدات.. و نەتەوەیەکی تر دەکاتە جیْگری ئیْوە و هەڵگری ئەم ئایینە ; کە وەك ئیْوە نەبنْ. و بەو سەر پیْچییەتان زیانیْ لە خوا نادەن, چونکە خوا توانایی بەسەر هەموو شتیْکدا هەیە و تەنیا خۆتان زیان دەکەن).

لەگـەڵ خەڵکیـدا تێکـەڵ نـەدەبووم, بـە تـەنیا دەچـوومە نـاو باخەکەمـەوە, ئەگـەر لـە باخەکـەیش بهاتمایە دەرەوە, زۆری نەدەخایانـد دەگەڕامـەوە بۆ گۆشە گیرییەکەی خۆم

دڵم بڕوایی نەدەدا بڕۆمە نـاو خەڵکـەوە, چـونکە نـاو شـار خـاوەن بـاوەڕێکی تیـا نـەمابوو, جگـە لـە چەند پیر و نەخۆشانە.. خۆ ئەگەر بیش ڕۆشتمایە, خۆم بە غەریب و نامۆ دەهاتە پێش چاو؟!

بـۆ ئـەوەی لـە ڕیـزی دووڕووەکـان نـەبم, گۆشەگیریم پێ چاتر بوو, باشترین جێگەش بۆ ئەم گۆشـە گیرییـە باخەکـەم بـوو.. بـەڵام لـەم گۆشـەگیرییەش بێـزم دەهاتـەوە, چـونکە باخەکـەم بـووە هـۆی دواکـەوتنم لـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەڵام ناچار بووم بۆ کوێ بچم؟

وەك جـاران سـەرنجی هێـشووە خورماکـانم نـەدەدا, ئەگـەر سەرنجێکیـشم بدانایـە, وام دەزانـی قـولاپێکن بـەرەو دۆزەخـم ڕادەکێـشن !! وام لـێ هـاتبوو وەك لـەوە پـێش سـەرنجی خێـزانم نـەدەدا, بـەڵکو هـەر نزیکیـشی نەدەکەوتمـەوە !! وە ئەگـەر

سەرنجێکیشم بدایە, شەمەسار دەبووم ! چونکە ئەوە دەهات بە خەیاڵما: ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتان هاوبەشییان کرد لە جیهادا بەڵام من وەك ئەوانیشم لێ نەهات..

ئەوەندە ڕقم لە خۆم دەبووەوە هەر وەختبوو پێستی لەشك بە نینۆك شەقار, شەقار کەم !! بێ ئاگا دەم گوت: ماڵ کاول خۆم, چیم کرد بە خۆم؟

هەواڵ گەیشت کە پێغەمبەر (ﷺ) و سوپای موسوڵمان پاش چەند ڕۆژێکی تر دەگەنەوە ناو شاری (مەدینە).. ئەم هەواڵەش گەیشت کە: فەرانڕەوای (ئەیلە)[1] بە دیارییەکی زۆرەوە هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و لەسەر (جیزیە) ڕێك کەوتوون و بووەتە لایەنگری موسوڵمانان, وە سوپای ڕۆمیش هەڵ هاتووە و کشاوەتەوە بۆ ناو جەرگەی شام..

---

[1]- بەندەرێکە لەسەر خەلیجی عەقەبەیە و زایۆنی دوژمن داگیری کردووە ئەو ناوی ناوە (ئێلات) بەندەرێکی گەورەیە..

وە هەروەها خەڵکی (شارەدێ) کانی (جرباء)[٢] و (اذرح)[٢] هاتوونەتـــە خزمـــەتی، ئـــەوانیش ڕێکەوتوون لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کە: لەسەر ئایینی خۆیان بمێننەوە (جیزیە) بدەن.

وە هەواڵێکی سەیر و سەرسوڕهێنەرمان بیست لە هەمان کاتدا دڵخۆش کەر، هەواڵەکە بم جۆرە بوو: پێغەمبەر (ﷺ) بە پێنج سەد سوارەوە خالیدی کوڕی وەلید دەنێرێ بۆسەر (ئەکیدەری کوڕی عبدالمالك) ی پاشای (دەومەتول جەندەل)، لەگەڵ ڕۆیشتنی (خالید) دا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ( لە ڕاوی کەڵە کێویدا تووشی دێیت)..

خالید لەگەڵ سوارەکاندا دەڕۆن، (ئەکیدەر) پاشا، هەواڵ دەزانێ کە سوپای موسوڵمانان هێرش دێننە سەریان، لەبەر ئەوە قەلا و دەروازەی شار قایم دەکەن، شەوێکی مانگەشەو لەگەڵ خێزانەکەیا لەسەر بانی کۆشکەکەیەوە دادەنیشێ و دیمەنی

---

٢- دوو ئاوایی گەورە بوون لە ناوچەی (کەرەك) ی ئێستای (ئوردون) دا.. منجد.

زيــوينى لمــى بيابــان كــه بــه شــەوقى مانگەشــەو دەدرەوشێتەوە سەرنجيان ڕادەكێشى.

لـەم كاتـەدا چـەند كەڵـە كێوييـەك نزيكـى قەڵاكـە دەبنـەوە و بـە شـوّق بـەر دەبنـە دەروازەى قەڵاكـە.. ئەوا (ئەكيدەر) و خێزانيشى دانيشتوون و چاويان لێيە, خێزانەكەى دەڵێت:

- هەرگيز شتى وات ديوە؟
- نەوەڵڵا..
- جـا, كـێ هەيـە شـتى واى بـۆ ڕێكـەوێت و خۆى لىٚ لادا؟
- هيچ كەس.

ئينجـا (ئەكيـدەر) فـەرمان دەكـات ئەسپەكەى بـۆ زيـن دەكـەن, براكـەى كـە نـاوى (حسان) دەبێـت و چـەند كـەس و كـارێكى خـۆى و كۆمـەڵێ دەسـت و پێوەنـد لەگـەڵ خۆيـا دەبـات, ڕم و شمـشێر لەگـەڵ خۆيانـا هەڵـدەگرن و لـە قـەڵا دەچـنە دەرەوە.. كەڵـە كێوييــەكان دەربــاز دەبــن ئــەمانيش دەكەونــە شــوێنيان, تــا دەگەنــە نزيــك هێــزى چــەكدارى موســـوڵمانان, موســـوڵمانان لێيـــان ڕادەپــەڕن,

(حەسان)ی برای پاشا دەکوژرێت و ئەوانی تریش لەگەڵ پاشا بەدیل دەگیرێن [٣]

بەم پێیە دەستی قودرەتی خوا خۆی تێکەیاند و کەڵەکێوی ڕام کرد, تا ئەرکی گەمارۆدانی قەلاکە لەسەر شانی موسوڵمانان لابات [١]

ئـــەم هەواڵانـــەم دەبیـــست لـــە لایەکـــەوە بەســـەرکەوتنی موســـوڵمانان شـــادمان دەبـــووم, لـــە لایەکیشەوە بێزم لە خۆم دەهاتەوە و ڕقم لە خۆم دەبـــووەوە, وام دەزانـــی توانـــەکانم وەك کێـــوی (ئوحـــود) وان و دەیانـــەوێت خۆیـــان بـــدەن بەســـەر سنگما و بم پلیشێننەوە..

خۆم بە خۆمم دەگوت: کەعب, داوەشێیت بۆ ئەم پەنـەی دات بـە خـۆت !! تـا زووە کونـە کـەمتیارێك بدۆزەرەوە و خۆتی تیا حەشاردە, چۆن ڕووت دێت

---

٣- ئەم ڕووداوە, لە لاپەڕە ٣٢٣ ی تهذیب سیرة ابن هشام دایە, وە لە تا ریخ الطبري بەرگی ٢ لاپەڕە ١٠٩.

١- لە فەرموودەکەدا (بقر الوحش) ە بەلام لە کوردیدا مانگا کێوی بەناوبانگ نییە, بۆیە کەڵەکێوی مان نووسی.

بەم ڕووە ڕەشەوە بڕۆیتە خزمەت پیَغەمبەر (ﷺ) !؟

ئەوەتە لەم کاتە ناهەموارەشدا پیَغەمبەر (ﷺ) تۆی لە یاد نەچووە و هەواڵی پرسیویت و فەرموویەتی: (کەعبی کوڕی مالیك چی کرد؟!) پیاویَکیش دەڵیَت: قوربان فیز و هەوا و دەوڵەمەندی ڕیَگەی نەدا بیَت !! (موعازی کوڕی جەبەل) یش سەرزەنشتی پیاوەکە دەکات و دەڵیَت: قسەیەکی باشت نەکرد، ئینجا ڕوو دەکاتە پیَغەمبەر و عەرزی دەکات: ئەی پیَغەمبەری خوا (ﷺ)، تەنیا چاکە نەبیَت هیچی ترمان لیَ نەدیوە پیَغەمبەریش (ﷺ) بیَ دەنگ دەبیَ و لەو بارەوە ڕای خۆی دەرنابڕیَت !!

بەڵی، بەم جۆرە ئەوەندەی تر دڵم ئازاری دەچەشت و ویژدانم سزای دەدام.. لە خۆمم دەپرسی و دەمگوت: کاتیَ کە پیَغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە، تۆ چ دەڵیَیت؟ بۆچ وەك (ئەبو خەیثەمە) نەڕۆیشتیت؟

بۆچ نەتبیست کە (ئەبوزەڕ) وولآخەکەی پێی خست و دواکەوت و خەڵکی وایان زانی ئەویش وەك ڕووخاوەکان خۆی دزیوەتەوە؟! کە زانی وولآخەکەی بڕ ناکات و لە پێ کەوتووە, لەو بیابانەدا جێی دێڵێ و کەل و پەلەکەی دەدات بە کۆڵیا, بە پێ وە تەنیا دەکەوێتە ڕێ.. پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بۆ پشودان دادەنیشن, لە دوورەوە تارماییەك دیاری دەدات, پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: دەی (ئەبوزەڕ) بە.. پاش ماوەیەك خەڵکەکە سەرسام دەبن, کە نزیك دەبێتەوە دەبینن (ئەبوزەڕ) ە, ئەوانیش مژدەی گەیشتنی ئەبوزەڕ دەبەن بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا ئەویش دەفەرموێ: (خوا بەزەیی بە ئەبوزەڕدا بێتەوە, بە تەنیا دەڕوات, وە بە تەنیا دەمرێت, وە بە تەنیاش زیندوو دەکرێتەوە ) !!

ئینجا خۆم کردە بەر پرسیار و گوتم: باشە کەعب, بۆ وەك ئەبوزەڕت لێ نەهات؟ خۆتت بە لاوە خۆشەویست تر بوو تا پێغەمبەر (ﷺ) ؟ گیانم وەلآمی دەدایەوە و دەیگوت: نەبەخوا, حەز دەکەم

خۆم بمرم و بەلاّم پێغەمبەر ﷺ دڕکێ نەچێت بە پێیا !! دەمگوت: ئەی ترسایت؟ لە ترسا نەڕۆیشتیت؟

دەیگوت: نەبەخوا، ڕۆژێ لە ڕۆژان نەم زانیوە ترس چییە؟!

بەلاّم لە کورتی بیبڕینەوە، من تەمبەڵیم کرد و گورج و گۆڵ نەبووم لە بەجێهێنانی فەرمانەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) بڕیار بێ هەرکاتێ فەرمانم پێ کرا ئەمڕۆ و سبەی پێ نەکەم و گورج جێبەجێی بکەم ، چونکە لە کۆنەوە گوتوویانە: بەشی زۆری ئاگری گەورە، لە پزیسکی بچووکەوە پەیدا دەبێت.. لە ڕاستیشدا وایە، من ئەم تەمەڵی کردنەم لە بەجێهێنانی فەرمانی پێغەمبەر بە بچوك زانی، تا ئاوا کەوتمە ناو گێژاوی ئەم دەریای سەرگەردانییە!!

جا نازانم، پێغەمبەر (ﷺ) بڕوام پێ دەکات یا بە مونافیقم دادەنێت؟! کەعبی نەگبەت، ئەو کاتە ئەگەر هەموو لیتەی دنیاش بکەی بەسەرتا سوودی نییە !!

هەروەها لەبەر خۆمەوە دەمگوت: وا چاكتر نەبوو یەكێك بوومایە لەو حەوت كەسە هەژارەی وولاخیان دەست نەكەوت سواری ببن و لەگەڵ پێغەمبەردا هاوبەشی بكەن؟ خۆ ئەگەر ڕێگە كە زۆر دوور نەبوایە، هەر بە پێ دەكەوتنە ڕێ و دەڕۆیشتن..

هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و بە توورەیی (الحاح) داوای وولاخیان كرد، ئەویش فەرمووی: (تەنیا وولاخێك نییە بتان دەمێ سواری ببن).. ئەوەندە هەتەرییان كرد پێغەمبەریان لە فەرمانەكانی دواخست، بۆیە سوێندی خوار سواریان نەكات، ئەوانیش بە دل شكاوی و چاوی پڕ لە فرمێسكەوە گەڕانە دواوە، هۆی ئەوەش بوو ناونران بكائون )

خۆم بە خۆمم دەگوت: سەرگەردان، خەڵكی وولاخیان دەست نەكەوت لەگەڵ پێغەمبەردا بڕۆن دەستیان كردە گریان !! خۆ تۆ دوو وولاخت هەبوو !! چ بەهانەیەكت هەیە؟ ئایا تۆیش وەك موونافیقەكان بڕوبیانووی هیچ و پووچ دێنیتەوە؟

٧

پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە و, شار بە جاریێ شادی و شایی تێکەوت, بە پەلە مونافیقەکان خۆ گەیاندە خزمەتی.. چەندەها بڕوبیانوویان هێنایەوە, لەگەڵ ئەوەدا کە دەیزانی چی لە دڵیاندایە, چاوپۆشی لێ کردن, لەسەر ڕووالەتی قسەکانیان لێیان خۆش بوو, بەلاّم لە بەرامبەر پەروەردگارا – کە ئاگاداری نهێنی دڵیانە – چی دەڵێن؟

ئەگەر ئەو مونافیقانە بە فرت و فێڵ لە سزای دنیا ڕزگاریان بوو, ئەی لە سزای قیامەت چۆن ڕزگاریان دەبێت؟ ئەو کاتەی ە زمانیان دەبەستریێ و پێست و دەست و چاو و گوێیان دێتە قسە و شایەتییان لێ دەدەن؟ تووشی کێشەیەکی دەروونی بووبووم دوو شتم لەبەردەمدا بوو, ئەوەیان کە شیرین بوو لەوی تریان تاڵتر بوو !! لەبەر خۆمەوە دەمگوت: نامەویێ فێڵ لە پێغەمبەری خوا بکەم, چونکە زاتی ئەوەم نییە درۆی لە خزمەتا بکەم, نەشم دەزانی چی بکەم؟!

ماوەیەك بەو جۆرە مامەوە، ئەوەی بە ژیر و تێگەیشتووم زانیبیایە لە خزمانم پرسم پێ دەرکدن و دەستە دامێنیان دەبووم تەگبیرێکم بۆ بکەن.. هەر تەگبیرێکیان بۆ دەکردم پێی دڵ ئاسوودە نەدەبووم!!

بەهۆی بیرکردنەوەی زۆرەوە شەوانە خەوم لێ هەراسان بووبوو ! هەر تەگبیرێکم دەکرد، زۆری پێ نەدەچوو لێی پەشیمان دەبوومەوە !!

پێم نا بە جەرگی خۆمدا و ڕۆیشتم بۆ خزمەتی و سەلامم پێش کەش کرد، پێغەمبەر (ﷺ) ناوچاوی گرژ کرد، تا بەو جۆرە تووڕەیی خۆی پیشان بدات، ئینجا زەردەخەنەیەکی تووڕەیی کرد و فەرمووی: (کەعب ) بۆچی وا دوا کەوتیت؟ ئەی تۆ وولاخت نەکڕی بۆ جەنگ؟ )

عەرزم کرد: بەڵێ چاووم پڕ بوو لە فرمێسکی گەرم و هەوڵم دا بیشارمەوە، دەم زانی تاوانبارم دەبێ تۆڵەی خۆم وەرگرم.. هەر چۆن بوو زاڵ بووم بەسەر خۆما و گوتم: ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ)، لای هەر پیاوێکی دنیایی بوومایە جگە لە جەنابت،

وەڵلاهی بە بڕ و بیانوو هێنانەوە خۆم ڕزگار دەکرد، چونکە خوا ئەندازەیەك قسەزانی و دەم تەڕی پێ بەخشیوم، بەلاّم وەلاّهی لێم ڕوونە ئەگەر بە درۆیەك تۆ ڕازی بکەم، خوا بەو درۆیە تووڕەت دەکات لێم..

خۆ ئەگەر قسەی ڕاستیشت بۆ بکەم لێم دڵ گران دەبیت، جا منیش ڕاست دەڵێم و هیوام بە لێبوردنی خوایە..

ئینجا بێدەنگ بووم، سەرنجی لێوی پێغەمبەرم دەدا بزانم چ دەفەرموێ؟ فەرمووی:(ئەمە ڕاست دەکات - لای کردەوە بە لامەوە و فەرمووی -: هەستە برۆ تا بزانین فرمانی خوا چۆن دەبێت )!

ئینجا منیش هەستام و هاتمە دەرەوە، بەلاّم ویژدانم هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد و هەموو گیانم پێدەکەنی کە توانیومە بە سەر لایەنی خراپەی دەروونما زاڵ ببم..

٨

هەر لەگەڵ هاتمە دەرەوە لە لای پێغەمبەر (ﷺ) ، کۆمەڵێ لە پیاوانی (بەنی سلیمە) کەوتنە شوێنم و سەرزەنشتیان کردم کە لە بەردەم

پێغەمبەردا (ﷺ) ددانم بە گوناهی خۆما ناوە !
ئینجا پێیان گوتم: تەنیا ئەوەندەت بەس بوو لە بەینی خۆت و خوادا داوای لێخۆشبوون بکەیت، وە خوایش لە گوناهت خۆش دەبوو، بەڵگەشیان ئەم ئایەتە بوو: ﴿وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[1]

زیاد لەوە گوتیان: پێ بزانین تا ئێستا گوناهت نەکردووە، لەبەر ئەوە جێگەی خۆی بوو مەعزەرەتت بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بهێنایاتەوە، وەك ئەوانەی تر کە دواکەوتبوون و پێش تۆ مەعزەرەتیان هێنایەوە !! ئەوەندە سەرزەنشتیان کردم و تانەیان لێ دام خەریك بوو بگەڕێمەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر و لەو قسە ڕاستەی خۆم پەشیمان ببمەوە !!

---

١- سوورەتی (النساء) ئایەتی ١٠٦ واتە: داوای لێخۆش بوون لە خوا بکە، بێگومان خوایش بەخشەر و خاوەن بەزەییە.

ئینجا سێ و دوویەکی دڵی خۆم کرد و دیتم کۆسپێکی گەورە لە ڕێمدایە, ئەو فەرموودەی پێغەمبەرم یاد کەوتەوە کە دەفەرموێت: ( بێگومان شەیتان هیوا بڕاو بووە لەناو ئێوەدا جارێکی تر, بت بپەرستری, بەلاَم بەوە لێتان ڕازی دەبێت: گوناه بکەن و ب بچووکی بزانن, ئەوەش لە ڕۆژی قیامەتا ە هیلاکتان دەبات, خۆتان بپارێزن لەو گوناهانەی بە بچوکیان دەزانن... [2]

ئینجا بە خۆمم گوت: وای بۆ تۆ کەعب ! ڕازی دەبیت دوای باوەڕ بگەڕێیتەوە بۆ کوفر؟ بەهۆی ئەو گوناهانەی شەیتانەکانی پری و ئادەمیزاد, لە پێش چاوتی شیرین و جوان دەکەن؟

کەعب, خۆگر بە بە نزمی ڕازی مەبە, هەوڵ بۆ بەرزی بدە, بۆ چ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرت لە یاد چووە (حفت النار بالشهوات, و حفت الجنة

---

٢- ئەم فەرموودەیە (ابو یعلی و الطبراني و البیهقي ), ڕیوایەتیان کردووە.

بالمكارة ) [٣]؟ بۆ ئەو ڕێگا ئاسانە دەگریتە بەر كە لە سزایەكی بچووك ڕزگارت بكات و بتخاتە ناو غەزەبی خوا و ئاگری دۆزەخەوە؟ پیاوی وەك تۆ چۆن دەبێت لە بەردەم پێغەمبەردا (ﷺ) درۆ بكات دەتەوێ درۆ بكەیت و بەم جۆرە تاوانێكی نوێ بخەیتە سەر تاوانی پێشووت. ؟!

ئا لێرەدا لایەنی خراپە لە دەروونمدا ؛ هاتە قسە و گوتی: ئاخیر ئەگەر ئەم درۆیە نەكەیت ؛ ناوت دەزڕێت, وە لەناو هەموو خاكی حیجازدا سەرشۆڕ و ڕسوا دەبیت !!

لایەنی چاكە لە دەروونمدا وەڵامی دایەوە و گوتی: قەیناكات, بێ گومان ئەم ئازارە هەر چۆن هەبێ لە ئازاری دۆزەخ سووك و ئاسانترە بۆچ تۆ توانای ئەوەت هەیە لەبەر ئاگری دنیادا خۆ بگری, تا توانای خۆگرتنت لەبەر ئاگری دۆزەخدا هەبێت؟!

---

٣- رواه البخاري و مسلم.. مانای فەرموودەكە بەم جۆرەیە: دۆزەخ بە هەوا و هەوەس دەوری گیراوە, و بەهەشتیش بەو شتانەی لای دەروون ناخۆشن..

ئینجا گوتم: وەڵلاهی لەو پێ لێنانەی خۆم پەشیمان نابمەوە و درۆ ناکەم، سزاکەم هەرچی دەبێت با ببێت.. ئەگەر درۆ بکەم چۆن لە سەرزەنشت کردنی ویژدانم ڕزگارم دەبێت؟ ئەگەر هەموو ڕۆژێك و هەموو سەعاتێك و هەموو دەقیقەیەك باوەڕەکەم بانگم بکات بڵێت: ئەری کەعب، چۆن ئەم درۆیەت کرد لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) ؟! چ وەلامێکی بدەمەوە؟

خۆ ئازاری دەروونی لەناو جێگەکەشدا خەوم لێ دەزڕێنێ، بەخوا ئازاری ویژدان زۆر بە سوێ ترە لە تانە و توانجی خەڵکی. ئینجا هاوارم لێ بەرز بووەوە و گوتم برا وازم لێ بێنن چاوەڕوانی دەکەم، بزان خوا چ سزایەکم بۆ دیاری دەکات، بە دڵ ڕازیم تۆڵەی تاوانی خۆم وەرگرم..

٩

ئەوەم دەزانی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوەڕوانی فەرمانی خوایە، بۆیە منیش هەموو کاتێك دەم پرسی: ئایا لە بارەی منەوە خوا هیچ سزایەکی دیار کردووە، یان نەء؟

ئـــەم پرســـیارە ماوەیـــەك بـــێ وەڵام مایـــەوە، ڕاســتییەکەی بیــستم دوو پیــاوەی ســاخی خــاوەن باوەڕ کە لە جەنگی (بەدر) دا بەشدارییان کردبوو – هیلالی کوڕی ئومەییـە وە مـەرارە ی کـوڕی ڕەبیـع – وەك مــن چــاوەڕوانی فــەرمانی خــودان، لــەبارەی هــەمان تاوانــەوە کــە مــنی تــێ کــەوتووم، هەنــدێ ئازاری دەروونم سووك بوو !!

بـە خـۆمم گـوت: هـیچ خـەمت نـەبێت تـۆیش وەك ئەوان.. گەڕامەوە بە لای کاری خۆمەوە چاوەڕوانیم دەکرد فەرمانی خوابێت..

بەڵام زۆری پێ نەچوو، سەرنجم دا خـەڵکی خـۆم لێ دەپارێزن، ئـەم هەواڵـەش وەك ئاگر بـەر بووبێتـە پووش و، ئاوەها لەناو خەڵکیدا بلاو بووەوە، بەڵێ، وام لــێ هــات خــەڵکی چــۆن لــە ووشــتری گــەڕ خــۆ دەپارێزن، ئاوەها خۆیان لێ دەپاراستم !!

تێگەیــشتم کــە فــەرمانی خــوا هــاتووە و داوا دەکـات: خـەڵکی کـەنارە گیریمـان لـێ بکـات و هـیچ کەس قسەمان لەگەڵ نەکات و نەمان دوێنێ، بەڵێ، ئەم سزایە بۆ هەرسێکمان بوو..

بە دڵ ڕازی بووم بە قەزای خوا و بە ویستێکی پتەوەوە پێشوازیم کرد و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئەمە تۆڵەی ئەو تاوانەیە کە بە دەستی خۆم کردم ! سەرزەنشتی خۆمم دەکرد و دەمگوت: دەبینی ئەمڕۆ لەناو خەڵکیدا چەند سووك و بێ نرخیت؟ خەڵکی چۆن ناوکە خورما لە دەمیان فڕێ دەدەن، ئاوەها تۆیش فڕێ دەدەن و نرخێکت نییە !!

ئینجا بە خۆمم گوت: ئەمە پاداشتی ئەو تەمەبەڵییەیە لە بەجێهێنانی فەرمانی پێغەمبەردا (ﷺ) پاشان خۆم دڵخۆشی خۆمم دەدایەوە و دەمگوت: بەڵکو ئەم سزایە ببێتە کەفارەتی ئەو تاوانەم و بۆ جارێکی تر تەمبێ ببم و هەرگیز تاوانی وا نەکەم..

١٠

چەند ڕۆژێ خۆم گرت، خۆگری و صەبریش سنوورێکی هەیە، صەبرم بەرەو نەمان دەچوو، ئاهەقیشم نەبوو، باوەڕت هەبێ کوورەی ئاگر چۆن ئاسن دەتوێنێتەوە، ئەم سزایەش ئاوەها دڵ و دەروونمی تواندبووەوە.. ئینجا شەیتانم بە نەعلەت

دەکرد و دەمگوت: با ئاگری ئەم سزایە دەروونم بتوێنێتەوە بەڵکو بەم کارە چڵك و چەپەڵی و خەوشی تیا نەمێنیٚ.. ئەها زێڕ لە توانەوەکەیدا خەوشی پێوە نامێنێت؟!

بەلاّم ئەمڕۆمەگەر خوا ڕەحمم پیٚ بکات, ئەگینە خەریکە پەتی (صبر) و خۆگرتنم دەپچڕیٚ, زیندانەکەم لە ڕواڵەتدا هەموو سەرزەوییە, گەورە و فراوانە, چونکە لە ژوورێکدا نەبەستراومەتەوە, بەلاّم لە ڕاستیدا زۆر تەسك و تەنگەلاّنترە لەوەی بێت بە خەیاڵدا.. ئەم زیندانەم کالاّی بالاّمە, ڕێك بە ئەندازەی لەشمە و هیچ زیاد و کەمی نییە.. بەڵیٚ, زیندانەکەم پێستی لەشمە !! بەڕەلاّم, نەبەستراومەتەوە, دەتوانم هەر کوێم بوێت بچم, بەلاّم کەس قسەم لەگەڵ ناکات, کەس نامدوێنیٚ, سلاّو دەکەم کەس وەلاّمم ناداتەوە !! بۆیە دەڵێم لە زیندانێکی سامناکدام, زیندانەکەم گەڕۆکە !! ئەڵقەڕێزێکی نادیار لە دەمم درابوو, لە سەرەتاوە زۆر هەوڵم دا ئەو ئەڵقەڕێزە بشکێنم, تا لێرە و لەویٚ لەگەڵ خەڵکیدا بدوێم و قسە بکەم, نەخێر,

هەوڵەکەم بێ سوود بوو، باشتر وایە هەر مل کەچ بم و لەگەڵ کەسدا نەدوێم.. خۆ لەگەڵ هەرکەسێکدا قسە بکەم، خۆیم لێ دەکاتە کەڕ و لاڵ !! بۆیە بەدوای هاوتاوان و هاو سزاکانما دەگەڕام: (هیلال) و (مەرارە)ی هاوەڵم.. لە دڵی خۆما دەمگوت: لەوانەیە لای ئەوان کەمێ دڵ ئاسوودە ببم، چونکە هاو دەرد و هاو بەژارە بووین، بۆ کردنە بینەوە و خەم و پەژارەی دڵی خۆمان بە با نەدەین؟!

ڕۆیشتم بۆ ماڵی (هیلال) دیتم لە گۆشەیەکەوە دانیشتووە وەك منداڵ دەگری، بەلاّم گریانێکی بە کوڵ !! ئەویش وەك من گیرۆدەی دوو سزایە: سزای ئاسمان کو: نابێ کەس قسەی لەگەڵدا بکات.. وە سزای دەروون کمە: ئەم کارە ناڕەوایەی کردووە و لە کۆمەڵی موسوڵمانان دوا کەوتووە..

لێی نزیك بوومەوە، ویستم قسەی لەگەڵدا بکەم، بەلاّم وەلاّهی وەك دەم دەمم بەسترا نەم توانی تەنیا قسەیەکی لەگەڵ بکەم ! .من بۆچی هاتم و چیم بەسەر هات؟! دەتگوت لێوم دووراون

بەیەکدا: ماوەیەك بەخەم و پەژارەوە, وەستام و هاتمە دەرەوە..

وە نەبێ لای (مەرارە) باشتر بووبم لەوەی لای (هیلال), بە ناچاری پاشە و پاش بە کوڵێ خەم و خەفەتەوە گەڕامەوە بۆ ماڵ, بەڵێ دەڵێن: (بۆ ڕیش چوو سمێڵی نا لە بانی) منیش چووم خەم بە بادەم, بەڵام بە کوڵێ خەمی زۆرترەوە هاتمەوە !!

١١

پەناگایەکم نەدییەوە جگە لە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بە گورجی ڕۆیشتم بۆ ئەوێ.. بەڵکو دەردەکەم کەمێ سووك بێت !!

پێغەبەر (ص) پاش نوێژ لەناو خەڵکەکەدا دانیشتبوو, هاتمە خزمەتی و سلاّوم کرد و گوتم: السلام علیکم..

لە جێگەی خۆما دانیشتم و چاوم بڕیبووە پێغەمبەر (ص) تا بزانم لێوەکانی دەجوڵێتەوە؟ بە ئاستەم لێوی جولاّ, ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو بە ئەسپایی وەلاّمی داومەتەوە.. منیش لە خۆشیدا ڕووی مۆنم گەش بووەوە..

ماوەیەك دانیشتم بەلچامو وەك نامۆیەك لە وولاتێکی بێگانەدا, ئەو خەڵکەی کە هەموو دۆست و برادەرم بوون وەك ئەوە هەر نەم ناسن و نەزانن خەڵکی کوێم !! بگرە پێغەمبەریش (ص) لە کاتی قسە کردندا ڕووی لێ وەردەگێڕام.. لەوە دەترسام بەخۆم نەزانم و ئیمانەکەم لە کیش بچێ, ەو بۆ هەمیشە سەرگەردان و سەر لێ شێواو بم..

هەستام نوێژم کرد, بە تیلی چاو دەم ڕوانییە پێغەمبەر (ص), ئای چەند دڵخۆش و شادمان بووم !! کە هەستم کرد بەلای چاو بۆم دەڕوانێ.. بەڵام هەر کات بە تەواوی بۆم بڕوانییایە سەیری نەدەکردم تێگەیشتم ه٩ێشتا بە تەواوی لە دڵی پێغەمبەردا نەکەنراوم..

تەنیا بۆ ئەوە سزا دەدرێم تا دەروونم پاك بێتەوە

بێ گومان ئەم پەشیمان بوونەوەیەم بەس نەبوو, ئەم سزایەی کە کێوەی گەورە بەرگەی نەدەگرت, وا دیاربوو هێشتا چارەسەر نەبوو بۆ تاوانەکەم !!

هەتا بهاتایە دەردم گرانتر دەبوو، ئازارم زۆرتر دەبوو، تاوام لێهات ئاواتم بە مەرگی خۆم دەخواست !! بەڵام بە داخەوە لەم ڕۆژانەی ژیانی مندا ; مەرگ بە ئاسانی دەست نەدەكەوت !!

پاڵم دابووەوە بە دیوارێكەوە و لاقم لێ ڕاكێشا، بە خەیاڵ ڕۆیشتم بیرم دەكردەوە تا چارەسەرێك بۆ خۆم بدۆزمەوە، تا ڕزگار ببم.. لەگەڵ خۆما قسەم دەكرد و دەمگوت: بەخوا: لای (ئەبوقەتادە) ی ئامۆزام نەبێ دڵخۆشیم دەست ناكەوێت.. چونكە ئەو –لە پێغەمبەر بگەڕێتەوە – خۆشەویست ترین كەسمە، ئێستا لە باخەكەی خۆیەتی، با بڕۆم بۆ لای.. بەڵكو لای ئەو هەندێ خەم و پەژارەم كوم بێتەوە و بە ئاسوودەیی هەناسەیەك بدەم !!

هەستام و ڕۆیشتم، لە نزیك باخەكەوە بە خۆمم گوت: بە خوا ئەمیش دەرگام لێ ناكاتەوە، ئازاری خۆم نەدەم و نەڕۆم بۆ لای باشترە !! چونكە موسوڵمانێكی ساخە و باوەڕێكی پتەوی هەیە و فەرمانی پێغەمبەر (ص) لەبەر خاتری من ناشكێنێ.. هەرچەند لە دڵەوە حەز دەكات قسەم

لەگەڵدا بکات وە بۆم دەپاڕێتەوە کە خوا دەرووی ڕەحمەتم لیّ بکاتەوە, بەلاّم خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر لە ژوور هەموو خۆشەویستییەکەوەیە

لە ئەنجامدا بڕیارم دا بڕۆم و بۆ لای بە لای کەمەوە با تاقی بکەمەوە بزانم ئایا ئەویش خۆیم لیّ کەڕ دەکات؟

١٢

ڕۆیشتمە سەر دیواری باخەکەی (ئەبو قەتادە) ی ئامۆزام و بازم دایە خوارەوە, چونکە لەو بڕوایەدا نەبووم ئەگەر بانگی کەم دەرگاکەم لی بکاتەوە, ماوەیەك گەڕام تا دۆزیمەوە کە بینیم سلاّووم لیّ کرد.. وەڵلاّهی جوابی نەدامەوە !! گوتم (ئەبو قەتادە), خوا نەتگریّ خۆ تۆ دەزانیت سلاّو کردن سوننەتە و وەلاّمەکەی فەرز و پێویستە؟!

بەو جۆرەش هەر وەلاّمی نەدامەوە و پشتی تیّ کردم, هاتمە بەرامبەری و گوتم: ئامۆزا, تۆ نازانیت کە: من خوا و پێغەمبەری خوام خۆش دەویّ؟

هەمدیسان بیّ دەنگ بوو وەلاّمی نەدامەوە باوەڕتان هەبێت -بەم کارەی- ئەگەر خنجەرێکی

بدایە لەسەر دڵم هەر ئەوەندەم ئێش پێ دەگەیشت..

بۆ جارێکی تر ڕۆیشتمە بن دەستیەوە دەستەدامێنی بووم گوتم: لە پێغەمبەر بگەڕێتەوە تۆ خۆشەویست ترین کەسی لای من !! قسە بکە، وەڵامم بدەرەوە.. تۆ نازانیت چەند خوا و پێغەمبەری خوام خۆش دەوێت؟ دووبارە ڕووی لێ وەرچەرخاندم و گوتی: خوا و پێغەمبەری خوا باشتر دەزانن.. ئینجا پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت و جێی هێشتم !!

بەو خوایە پێم خۆش بوو زەوی ناوسکی بۆ بکردمایەوە و هەڵی لووشیمایە و ئەو حاڵەم بە خۆمەوە نەدیبایە !!

خوڕ، خوڕ فرمێسك بە چاوما هاتە خوارەوە، دەستم کرە گریان، گریانێکی گەرم و بە کوڵ، وەك ئەوە بە ئاگری بڵێسەدار دەروونم گەرم کرابێ !!

پاش ماوەیەك فرمێسکەکانم سڕی، وازم لە گریان هێنا، ترسی ئەوەشم هەبوو دارخورما باڵا بەرزەکانیش سەرزەنشتم بکەن و ئەوەم یاد

بخەنەوە: كاتێك پێغەمبەر (ص) لەگەڵ سوپاكەیا یەو جەوەنەیەك ئاو هەبوو بیخۆنەوە, تۆیش لە سێبەری چڕ و پڕی باخەكەتا و لە پەنای ئاوی ساردا دانیشتبوویت و ڕات دەبوارد !!

ئارامی و دان بەخۆداگرتن نەبێ چارێكی ترم نەبوو.. ئەوەندەش خەفەتم خواردبوو تەواو لاواز و بێ هێز بووبووم  باوەڕت هەبێ لاقەكانم توانای هەڵگرتنی لەشی تێكشكاوی منیان نەمابوو, لەشیشم بریتی بوو لە پەیكەرێكی ئێسكی و بە پێست داپۆشرابوو !!

بەڵێ, بەرەو دەرگای باخەكە كەوتمە ڕێ و گەڕامەوە بە جێگەكەی خۆما, بەڵام دەرگا داخرابوو.. بانگی ئامۆزاكەم نەكرد بێت دەرگاكەم بۆ بكاتەوە, چونكە ئەمزانی كە نایەت ! بە دیواری باخەكەدا هەڵزنام و بازم دایە خوارەوە و لە كوێ وە هاتبووم گەڕامەوە بۆ ئەوێ, بە كوڵێ خەفەت و داخەوە.. پاش ئەوەی خۆشەویست ترین كەس, لە ناهەموار ترین كاتدا ڕووی لێ وەرگێڕام و پشتی تێ كردم !!

ملی ڕێگەم گرتبووە بەر, کاتێکم زانی خۆم لە ناو بازاڕا دییەوە بەڵام, صەدبریا هەر نەڕۆیشتمایە.. لەو کاتەدا کە لە ناو بازاڕا دەگەڕام, یەکێك لە جوتیارەکانی شام - کە بۆ دەغڵ و دان فرۆشتن هاتبوو بۆ مەدینە - دەیگوت: کێ (کەعبی کوڕی مالیك) م پیشان دەدات؟ خەڵکیش پەنجەیان بۆ من ڕاکێشا و بە تیلی چاو بۆیان دەڕوانیم تا گەیشتە لام..

لەناو غەباکەیا نامەیەکی دەرهێنا و دایە دەستم.. ئای چۆن ئەبڵەق بووم کە بینیم پاشای (غەساسینە) چ پەیوەندییەکی هەیە بە منەوە تا نامەم بۆ بنێری؟ لەوانەیە نامە گەیەنەرەکە لێی تێك چووبێت

پێش ئەوەی دوور بکەوێتەوە بانگم کرد و پرسیارم لێ کرد و گوتم:

-: پێیان گوتی ئەم نامەیە بدەیت بە کێ؟

-: بە تۆ..

-: من؟

-: بەڵێ تۆ !

ئینجا قسەكەی تەواو كرد و گوتی: بۆ چ تۆ (كەعبی كوڕی مالیك) نیت لە هۆزی (بەنی سەلەمە)؟!

بە سەرسامییەكی زۆرەوە گوتم: بەڵێ، من كەعبم..

گوتی: پاشای (غەسان) بۆ تۆی ناردووە، نامەكە بكەرەوە بزانە چی تێدایە ! هیچ سەرسامیش مەبە.

نامەكەم كردەوە، بەڵام صەدبریا نامەكەم نەكردایەتەوە و پێش ئەوە چاووم كوێر ببوایە !!

بە خۆمم دەگوت: كەعب، پلەی مونافیقیت بەرز بووەتەوە !! ئەوەندە لاواز بوویت پاشای غەسسان تەماح بكاتە ئایینەكەت و بۆت بنووسێت: (بیستوومە هاوڕێكەت –مەبەستی پێغەمبەر بووە- ئازاری داوی، تۆ خوا نەیكردوویت بە جێگەی ڕیسوایی و چەوساندنەوە، وەرە بۆ لای ئێمە، ڕێزت لێ دەگرین )

لەبەر خۆمەوە گوتم: خوایەگیان، منی دڵ بریندار دەرد و ئازاری خۆمم بەزۆر دەزانی، وا

پاشای غەسسانیش دەیەوێت برینەکەم هەڵکوڵێ و بم کوژێ.. لەوانەشە ئەمەی بە هەلێکی باش زانیبێت بۆ ڕاوکردنی ماسی لە ئاوی لێلاّ.. بە هۆی تەمبەڵی و کەمتەرخەمی خۆمەوە باوەڕەکەم لاواز بوو، وا ئێستا ئەویش دەیەوێ بە تەواوی باوەڕەکەم بمرێنێ..

نا، نا، وەڵڵاهی نابێ دوژمن بە خۆم شادکەم.. هەرگیز نابێ پەنا بەرمەبەر خیانەت و ناپاکی، دەبێ ئەو پەروەردە ئیمانییەی پێغەمبەری خوا (ص) لە کاتی وادا نەبێ و، لە چ کاتێکدا دەردەکەوێت؟! پاشای گەمژەی وا نازانێ کە من ویژدانم ئازارم دەدات, ئەو کە ئیمانی نییە چوزانێ ئازاری ویژدان چییە؟ پێغەمبەری خوا (ص) دڵمی پڕ کردووە بە خۆشەویستی خوا و بەرنامەکەی پرشنگی زێڕ و خرنگە، خرنگی زیو و نەرموڵی ئاوریشم ئەو باوەڕەم لەق ناکات..

بەدبەخت تۆ لە کوێ مرۆڤێکی بەندکراوی وەك من دڵخۆش دەکەیت؟ ئەگەر بتوانم هەلبێم

زیندانەکەم لەگەڵمایە و بگرە قایم تر و پتەو تر دەبێت..

تەنیا دەستی دەسەلاتی پەروەردگار نەبێت، هیچ هێزێك نییە بتوانێت ئەڵقەڕیزی دەرگای ئەو زیندانە بشکێنێ و ڕزگارم کات..

هەی پاشای ماڵ کاول، کێ گوتی: من ڕیسوا کراوم، ڕسوایی مرۆڤ لەوەدایە کافر بێ و هاوەڵ بۆ خوا دانێ.. زبری پێغەمبەرم لە نزیکی و ڕێزی تۆ زۆر پێ خۆشترە، برۆ بە شوێن یەکێکی ترا بگەڕێ، من بە تۆ هەڵ ناخڵەتێم.. تۆ زۆر لەوە کەمتری بتوانی بم گێڕیتەوە بۆ کوفر و بێ باوەڕی..

لام کردەوە بینیم تەنووریێ داخراوە، تا هێزم تیا بوو نامەکەم فڕێ دایە ناو گڕەکەیەوە، چاووم تێ بڕی تا بە تەواوی سووتا، وام دەزانی بە ئاگری بڵێسەداری ڕق و کینەی دەروونم دەیسوتێنم !!

١٣

بڕیارم دا بەرەو ماڵەوە بڕۆمەوە، چونکە ئیتر پێم خۆش نەبوو کەس ببینم، تا ئەو باوەڕەی لە دڵما ماوەتەوە زەدە نەبێت.. لە دڵی خۆیشما ئەم بڕیارەم

دا و گوتم: کە ڕۆیشتمە ماڵەوە, ئیتر مان دەگرم و نایەمە دەرەوە, تا خوا دەروویەکم لێ دەکاتەوە..

بەڵێ, ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵ و تا ماوەیەك نەهاتمە دەرەوە.. ڕۆژێ پیاوێك هات بۆ ماڵمان و هەواڵی منی پرسی, کە گوێم لێ بوو هەواڵی من دەپرسێ, لە خۆشیدا وەخت بوو باڵ بگرمەوە, چونکە لەم ماوە دوور و درێژەدا ئەمە یەك جار بوو موسوڵمانێك هەواڵم بپرسێ و بیەوێ لەگەڵما بدوێت !! بە پەلە بەرەو پیری چووم..

کە زانیم ئەمە نێرراوی پێغەمبەر (ص) ئەوەندەی تر شادمان بووم !! چونکە وام دەزانی مژدەی لێ خۆش بوونی بۆ هێناوم و لەم زیندانە ڕزگارم دەبێت, ئەو زیندانەی کە چل ڕۆژی ڕەبەقە تیا دەتلێمەوە و بەلامەوە لە چل هەزار ساڵ کەمتر نەبوو !!

بەڵام هەواڵێکی دڵتەزێن و چاوەڕوان نەکراوی پێدام, وەخت بوو لە هۆش چم, یا دڵم بووەستێ !! نێرراوەکە گوتی: پێغەمبەر (ص) فەرمانت پێ دەکات لە خێزانەکەت دوور کەویتەوە

ئیتر حاڵی بووم کە لەم جیهانەدا کەسم بۆ نەماوەتەوە, بگرە ئەو خێزانەشم کە ماوەیەکی زۆرە لەگەڵیا دەژیم, ویستی خوا وایە لێی کەنارە گیر بم و ئەویشم بۆ نەمێنێتەوە !!

ئەم چل ڕۆژەی لەم زیندانەدا بردمە سەر هێشتا بەس نییە !! ئەوەتە سزایەکی نوێم بۆ ئامادە کراوە کە سزاکەی پێشووم قورس و گران تر بکات !!

باوەڕت هەبێ بەردەبارانم لەم زیندانە پێ خۆشتر بوو, خۆم لەناو خۆڵا گەوزاند و دەستم کردە پاڕانەوە و دەمگوت: خوایەگیان, پەشیمان بوومەوە, تو گەورەیی خۆت, لێم خۆشبە و سزا قورسەکەم بۆ بکەرە پاك کەرەوەی دەروون تاوانکارم..

ئینجا سەر زەنشتی خۆمم دەکرد و بە خۆم دەگوت: بناڵێنە, بمرە, خوا و پێغەمبەی خوات لە خۆت توورە کردووە, بە ئاگری دۆزەخ نەبێت پاك بوونەوەت نییە !!

لەم حاڵەتەدا بە ئاگا هاتمەوە بە دەنگی نێرراوەکە, کە گوتی: ئیتر من دەڕۆم, گوتم: برا

بوەستە, پرسیارێکم هەیە: پێغەمبەر (ص) مەبەستی ئەوە بوو خێزانەکەم تەلاق دەم؟

بە دەم ڕێوە کە دەگەڕایەوە گوتی: نەء.. بەڵکو فەرموویەتی: لێی گۆشەگیر بیت و نزیکی نەکەویت..

هاتمە ژوورەوە کەوتمە ناو گێژاوی دەریای بێ بنی خەیاڵەوە, ڕۆچووم لە بیر کردنەوەدا, هەزارەها شتی خراپ دەهات بە دڵمدا, وەك ئەوە: خۆ کەس چاودێر نییە بەسەر ئەوە هەر چی بکەیت کەس ئاگای لێ نییە.. هتد

منیش چاوی خۆمم وڕلی و (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم ) م کرد و ئینجا سوورەتی (قل اعوذ برب الناس) م خوێند و گوتم: دەبێ فەرمانەکەوی پێغەمبەر (ص) جێبەجێ بکەم, هاوارم کرد و گوتم: سوێند بە خوا دەبێ توخنی نەکەومەوە و کەنارەگیر بم لێی.. بەڵام کێ دەڵێ لەم کەنار گیرییەشدا ناکەومە گوناهەوە؟ هێشتا لە تاوانی سەرپێچی یەکەمم ! ڕزگارم نەبووە, چۆن لە خۆم دڵنیا بم کە لەم کەنارە گیرییەدا فەرمانەکەی

پێغەمبەر (ص) ناشکێنم, بە تایبەت منێ کە هێشتا گەنجم و لە هەڕەتی لاویدام؟!!

ئەگەر دروست بێ (هیلالی کوڕی ئومەییە) خێزانەکەی لای بمێنێتەوە و خزمەتی بکات جێگەی خۆیەتی چونکە (هیلال) پیر بووە و کەوتوٚتە ساڵەوە, بەلاّم بە هیچ جوٚر بۆ من دروست نییە, چونکە من هێشتا گەنجم !!

دەترسم بکەومە داوی ئارەزووی دەروونەوە پێم هەڵخلیسکێ و خۆمم بۆ زەوت نەکرێ و فەرمانەکەی پێغەمبەر (ص) بشکێنم و بە تەواوی تیاچم

ئەوەش ئاشکرایە: شەیتان بۆ هەل دەگەڕێ, ئەو شەیتانە نەعلەتییەی کە وەك خوێن بە هەموو لەشی مرۆڤدا دەگەڕێ.. دەبێ خۆم لەم پەرێز و قەدەغەیە دوور خەمەوە, چونکە ئەگەر لێی نزیك بم لەوانەیە تێ کەوم, خۆ ئەگەر شوان مالاّتەکەی بە دەوری پەرێزدا بلەوەڕێنێ, لەوانەیە مالاّتەکەی بکەوێتە نا

قەدەغەکەوە.. دەبێ هۆشیار بم چونکە پەرێزی خوا بریتییە لەو شتانەی کە حەرامی کردووە [1]

کەوابوو دەبێ لە پەرێز و قەدەغەکراو دوور کەومەوە و خێزانم بنێرمەوە ماڵی باوکم، تا خوا دەروویەك دەکاتەوە.. ئەم بڕیارەم دا و بە دەنگی بەرز خێزانم بانگ کرد، ئەویش بە پەلە هات، بە سەرسامییەکەوە گوتی: (کەعب)، لەسەر خۆ بە، تۆ بە داخ و خەفەت خواردن خەریکی خۆت دەکوژی !! لەسەر خۆبە من لە پەناتام و بە گوێرەی توانا کۆڵی گرانی خەم و پەژارەت لەسەر شان سووك دەکەم !! ئەوەش بزانە دەرووی خوا نزیکە و زۆریش نزیکە!!

منیش گوتم: ئافرەت، ئەم قسانە بۆ من مەکە، چونکە قسەکانت بە جێ نین، بگرە لە جێی خۆیانا نین.. بە خوا من ئەو خاوەن باوەڕە نیم، وا دەردەکەوێ ئازاری تاڵتر و ئێشی ناخۆشتر

---

١- ئەم چەند ڕستەیە واتای ئەم فەرموودەیەیە کە (مسلم) ڕیوایەتی کردوە: (من حام حول الحمى یوشك أن یقع فیه. الا ان حمى الله محارمه).

چاوەڕوانیم دەکات !! داواکارم خوا یارمەتیم بدات بۆ خۆ گرتن لەبەر باری گرانی ئەم بەلآیەدا..

گوتی: کەعب بۆ چ وا دەڵێیت؟ ئەوەندە ڕەش بین مەبە !!

گوتم: هیچم نییە, بەلآم بڕۆرەوە ب.. بۆ مـ, ماڵی بـ.. باوکت.. پچڕ, پچڕ ئەم قسەیەم وەك خەنجەرێك وابوو بۆ سەر دڵی ئەو بەستەزمانە..

خراپ تێگەیشت, بۆیە خوڕ, خوڕ فرمێسك لە چاوی هاتە خوار و گوتی: پیاوەکە, بڕۆمەوە بۆ ماڵی باوکم؟ تاوانم چییە وا تەلآقم دەدەیت؟ دەترسم تێك چووبیت؟!

گوتم: نا, نەوەڵلاّ شێت نەبووم وە منیش تەلآقت نادەم, ئەوەندە هەیە دەمەوێ لە ماڵی باوکت بمێنیتەوە, تا خوا دەرووم لێ دەکاتەوە, فرمێسکە گەرمەکانی چاوم سڕی و گوتم: پێغەمبەر (ص) فەرمانی داوە هەرسێکمان – کەعب و هیلال و مەرارە – کەنار گیر بین لە خێزانەکانمان.. ئەگەر تۆیش لێرە بمێنیتەوە سەرنجم دەدەیت, منیش سەرنجی تۆ دەدەم, دەترسم فەرمانەکەی پێغەمبەر

(ﷺ) بشكێنم, چونكە هەردوكمان گەنجین, جا, لەبەر ئەوە تۆ بڕۆرەوە بۆ ماڵ باوكت تا خوا دەروویەكمان لێ دەكاتەوە لە بارەی ئەم تاوانەی منەوە لێ بوردن دەنێرێ و لەم سزایە ڕزگارمان دەبێت ...

١٤

ئـافرەتی بەسـتەزمان كـەزانی ئەمـە حاڵەكەیـە, بـو ناچاری هەنـدێ جل و بـەرگی خـۆی پێچایەوە و ڕۆیشتە دەرەوە, بە چەند سـەرنجدانێك كە پڕ بوون لە سۆز و بەزەیی خواحافیزی ماڵاوایی كرد.. منـیش نـەك بـەدەم بـەڵكو بـە دڵ خواحافیزیم كـرد, بـە هیـوای دەرووی ڕەحمـەت و پێـك شـاد بوونەو...

بـەرەو مـاڵ كەوتـەڕێ دەرگـای لەسـەر پێـوەدام, پەردەیـەكی تـاریكی بەسـەرما, نزیـك بـوو وورە بـەردەم و بڕوخێم.. توانـای بیر كردنەوەیـشم نـەما, گۆڕەپـانی هەسـت و شـعورم چـۆڵ بـوو لـە هـەموو شـتێ, تـەنیا لـە چـەند خـەون خـەیاڵێك نـەبێ كـە وێنەكانیان بە پێش چاوما تێ دەپەڕین..

چارم نەما پەنابردنە سەر پەروەردگار نەبێ، بە شەو و ڕۆژ لێی دەپاڕاماوە دەلالآمەوە لە گوناه و تاوانم خۆشبێ، چونکە هیچ کەس توانای نییە لە گوناهم خۆش ببێ، ئەو نەبێت..

دەستم کرد بە ڕاز و نیاز لەگەڵ خوادا، ماوەیەك دەلالآمەوە، ماوەیەکی تر سوپاس گوزاریم دەکرد.. جارێ وا بوو دەمگوت: خودایە، لە تۆ زیاتر پەنایەکم نییە، دڵ و دەروونم تەنگ بووە و هەناسەم سوار بووە، بگرە سەرزەوی پان و پۆڕم لێ تەنگەڵان بووە، وەختە دیق بکەم، خودایە تەنیا تۆی فریادڕەس، پەنام پێ هێنای فریام کەوە..

١٥

دە ڕۆژی تر ڕۆیشت و ماوەی زیندانەکەم بووە پەنجا ڕۆژی تەواو، لە سەربانی خانووەکەی خۆم - بە نوێژ و پاڕانەوە و نزا و داوای لێ خۆش بوون لە خوا - شەووم ڕۆژ دەکردەوە تا بەرەبەیان خەوم لێ نەدەکەوت، وا بزانم خەویشم لێ تۆرابوو

ڕۆژی پەنجاو یەکەم ؛ نوێژی بەیانیم لەسەربان کرد و دانیشتم، هەروەك بۆم باس کردن: لە گیانی

خـۆم وەڕس بووبـووم، سـەرزەوی پـان و پـۆڕم لـێ هاتبووە یەك، مەرگی خۆمم بە ئاوات دەخواست !!
ئـا لـەو کاتـەدا دڵتەنگییـەدا گـوێم لـە دەنگـی پیاوێکـەوە بـوو، لەسـەر تەپۆڵکـەی (سـلع) ەوە بـە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: کـەعبی کوڕی مالیك، مژدەبێ !!
لـە خۆشـیانا وەخـت بـوو شـایمەرگ بـبم، بـۆ سوپاسـگوزاری سـوجدەی شـوکرم بـرد و ناوچـاوم خستە سـەرخاك بـۆ پـەروەردگار، زانـیم کـە: خـوا پەشـیمان بوونەوەکـەی لـێ وەرگـرتین و دەرووی ڕەحمەتی لێ کردووینەوە..
هەڵوێستەکەم کرد و سەرنجی تەپۆڵکەی (سەلع) م دەدا، چـاوەڕوانی دەنگەکـە بـووم بـەڵکو دووبـارە ببێتە تا بە تەواوی دڵنیابم، هەرچەند بە تاسەوە بۆ دەنگەکە بەڵام دەنگ نەما، خەریك بوو هەناسەم لێ ببڕێ و گیانم دەرچێ، ئای چۆن ڕەنگم تێکچوو !!
بەڵام زۆری نەخایاند پڕمە پڕمـی وولاخێك هاتـە گـوێم، تمـەزم مـژدە دەرەکـە بـە غـاردان هـاتووە و گەیشتۆتە بەردەرگا، سوارەکە پیاوێك بوو لە هـۆزی

(ئەسلەم) گورج لە ئەسپەکەی دابەزی، منیش بەرەو ڕووی ڕۆیشتم و ئەویش بەرەو ڕووم هات، پێش ئەوەی پێك بگەین، هەموو گیانی پێ دەکەنی و گوتی: کەعب، مژدەبێ، دەستمان کردە گەردنی یەك و تێر ئەم لاو لای یەکترمان ماچ کرد و دووبارە گوتی: کەعب، مژدەم بدەیێ پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کردین کە: خوا تەوبە و پەشیمانی لە هەرسێکتان وەرگرتووە و لێتان خۆش بووە !!

خوڕ خوڕ فرمێسك لە چاوم هاتە خوارەوە، بەڵام ئەم فرمێسکانە جیاواز بوون ل فرمێسکەکانی پێشوو، ئەم جارەیان فرمێسکی شادی بوو، لە مژدانەدا دوو بەرگم هەبوو ئامادە بێت، هەر دووکیانم پێ بەخشی، گوتم، برا، خوا مژدەی بەهەشتت بداتێ، باوەڕت هەبێ هەرشتێکم لە دەستا بوایە پێم دەبەخشیت !!

ئینجا خۆیشم دوو بەرگم خواست و بە هەڵە داوان ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ، لە ڕێگەدا پۆل پۆل موسڵمانانم تووش دەبوو پیرۆزباییان لێ دەکردم و دوعای خێریان دەکرد و سوپاسگوزاری

خۆیان بۆ خوا دەردەبڕی, کە ڕزگاری کردم لەم زیندانە و دەرووی لێ کردمەوە..

سەر لە نوێ لە دایك بوومەوە.. خەڵکی بوونەوە بە هاوەڵ و برادەرم.. پاش ئەم مژدەیە هەموو بە جارێ شادمانی خۆیان دەربڕی.. وام دەزانی هەموو دنیا لە خۆشی مندا پێدەکەنێ.. بەڵێ, ئەم جارەش سەرکەوتم و بەسەر شەیتانا زاڵ بووم, بۆیە خۆم بە بەختەوەر ترین کەس دەزانی..

١٦

ڕۆیشتمە مزگەوت, پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکێکی زۆری بە دەورا دانیشتبوو, کە منی دی ڕووی گەشایەوە, ئای ئەو سەرنجدانەی پێغەمبەرم چەند پێ خۆش بوو !! ئەو خەڵکەی دەوریشی هەموو سەرنجیان دەدام, ئەوانیش لە خۆشی مندا ڕوویان گەش بووەوە و هەموو یەکێکیان دەیویست هەستێ و دەست لە گەردنم کات, تا بەو جۆرە شادمانی خۆی دەربڕێ, بەڵام سەنگینی کۆڕەکە (مجلس) ەکە هۆی ئەوە پڕ نەکێشن هەستن و دەست لە ملم

کـەن.. بەلـچامی بـە سـەپۆلی جیهازەکـانی دڵیانـا پیرۆز باییان بۆ جیهازی دڵم دەنارد..

بـرای کۆچـەر (مهـاجر) (طـەلحـەی کـوڕی عوبەیدیللا) لە خۆشییا ئاگای هەیبەت و سەنگینی کۆڕەکەی پێغەمبەر (ﷺ) نەما, بۆیـە بەپەلـە بەرەو ڕووم هات و دەستی گوشیم و ئم لاو لای ماچ کـردم و پیرۆزبایی پـیٚ گـوتم, پیاو واقیعـی بێـت, هـەرگیز ئەو هەڵوێستەی طەلحەم لە بیر ناچێتەوە !!

ئینجا ڕووم کـردە پێغەمبـەر (ﷺ) سـلاوم پـێش کـەش کـرد و لەبـەردەمیا دانیـشتم, دەم و چـاوی پـیرۆزی لـە خۆشـی مـن دەدرەوشـایەوە وەك مـانگی چـواردە گەشـایەوە.. خونـچەی لێـوی کرایـەوە, جـوانترین و خۆشترین دەستەواژە (عبارە) ی دا بـە گوێما ! فـەرمووی: (مـژدەبیٚ بـە چاکترین ڕۆژیٚ کـە بەسـەرتا تێدەپـەڕێت لـەو ڕۆژەوە لـە دایـك بوویـت ) خۆشـی و شـادی وای لـیٚ کـردم هەنـدیٚ هـەڵس و کـەوت بکـەم شـیاوی گـەورەیی و ڕێـزی ئـەو کـۆڕە نەبێت, هەرچۆن بوو هەوڵم دا و توانیم بەسەر خۆما زاڵ ببم, لـە بـارەی ئـەم مژدەیـەوە پرسیم و گـوتم:

ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەم مژدەیە لە لایەن جەنابتەوەیە یا لە لایەن خواوەی؟ فەرمووی: نەخێر، لە لایەن خواوەیە.. ئەم شەو (جبرەئیل ئەم چەند ئایەتەی بە وەحی بۆ هێنام:

﴿لَقَد تَّابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ.... وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾[1]

---

[1] - ئەم ئایەتانە ئایەتی ١١٧ و ١١٨ لە سوورەتی (التوبە). واتە: بێگومان خوا تەوبەی وەرگرت لە پێغەمبەر و.... و لەو سێ کەسەش دوا کەوتبوون ئەوانەی کە وایان لێ هات: زەوییان بەو هەموو گوشادی و فراوانییەوە لێ تەنگ بووەوە و گیانیان لێ بووە بار و تەنگە نەفەس بوون، پێیان وابوو کە پەنایەك نییە لە خەشمی خوا بیانپارێزێت، جگە لەپەنابردنە بەر خواخۆی نەبێ. واتە: لێیان ڕوون بوو هیچ پەنایەکی تر جگە لە پەنای خوا سوودی نییە بۆ ئەوان، ئینجا خوا لێیان خۆش بوو، با پەشیمان ببنەوە و تەوبە بکەن، بەڕاستی خوا تەوبە قبولْ دەکات، و میهرەبانە بۆ ئەوانەی پەنای بۆ دێنن.

پێغەمبەر (ﷺ) هێشتا ئایەتە پیرۆزەكەی تەواو نەكردبوو هەموو گیانم پێدەكەنی نەم دەزانی چی بكەم؟ بە لای ڕاست و بەلای چەپدا لام دەكردەوە.. وام دەزانی هەموو دنیا لە شایی و زەماوەندایە, ئەو پەردە ڕەشەی درابوو بەسەر چاوما لابرا, لەگەڵ تیشكی زێڕینی خۆری پەنجاو یەكەمین ڕۆژ ـی ئەو ماوە ڕەشەی مێژووی ژیانم- تاریكیكم لێ ڕەوییەوە و دنیام بە ڕووناكی دی..

١٧

ئای لەو خۆشی و شادییە !! ئەو ئایەتانەی لە بارەی ئێمەی دوا كەوتوو هاتووە و لێ خۆشبونمانی تێدایە, تا ڕۆژی قیامەت بەدەم موسوڵمانانەوە دەخوێندرێتەوە !! ئەوی تەوبەیەی بە فرمێسكی چاومان شێلراوە و بە خوێنی دڵمان ئاوێتە كراوە..

ئەوی من بیرم لێ دەكردەوە بووبووە خایلەی شەو و ڕۆژم باخ و سامانەكەم بوو.. وەك ئەوە لە دوورەوە چاوم لێ زەق بكەنەوە و پێم بڵێن: بەهۆی ئێمەوە ئێمەوە كەوتیتە بەر خەشمی خوا..

پێم بڵێن: بەهۆی ئێمەوە کەوتیتە بەر خەشمی خوا..

بەهۆی ئێمەوە پەنجا ڕۆژ تاڵترین تاڵاوت چەشت لەو زیندانە تاریك و سامناکە گەڕۆکەدا..

ئێمە بووین دواکەوتین لە پێغەمبەرمان لا شیرین کردی..

ئێمە بووین نەمان هێشت فەرمانی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بە جێ بێنیت..

ئێمە بووین ئەو پەنەمان پێ دایت، تۆ دەتوانی چی بکەیت؟

منیش خۆم پێ نەگیرا و بێ پەروا گوتم: بەڵێن بێ تۆڵەتان لێ بسێنم، بەڵێ، بڕیاری خۆم بردەسەر و لام کردەوە بەلای پێغەمبەرەوە و گوتم: پەشسمان بوومەتەوە و تەبەم کردووە، دەمەوێت واز لە باخ و سامانم بێنم و هەمووی ببەخشم بە خوا و پێغەمبەری خوا (ﷺ) !!

کە ئەم قسەیەم کرد بە تەواوی دڵ ئاسوودە بووم، چونکە هەستم دەکرد لە دەست مەترسییەکی گەورە ڕزگارم بووە، من ئەم قسەیەم کرد، لەگەڵ

ئەوەدا کە ئاگام لێ بوو (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) جارێکیان هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و ویستی دوو سێ یەکی ٢\٣ ی سامانەکەی پاش خۆی بکاتە خێر, بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) پێی گوت: ( سێ یەکێك بەسە و هێشتا سێ یەکیش زۆرە ئەگەر تۆ منداڵەکانت بە دەوڵەمەندی جێ بێڵیت باشتر لەوەی بە هەژاری جێیان بێڵی و بەسەر خەڵکییەوە بژین [1] !!

وە هەروەها فەرموودەیەکی پێغەمبەریش (ﷺ) لە گوێما دەزرنگایەوە کە دەیفەرموو: (موسوڵمانی بەهێز چاکتر و خۆشەویست ترە لای خوا لە موسوڵمانی لاواز ) [2]

بەلاَم من توانای بینینی ئەو ماڵ و سامانەم نەمابوو, کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بوونە هۆی ئەوە تووشی ناخۆشترین ئازار و دەردەسەری بم ! ئەمەم

---

١- ئەمە حەدیسێکە کە بوخاری و موسلم ڕوایەتیان کردووە

٢- موسلم و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە.

گوت: تا بە دەروونی تاوانكاری خۆمی بسەلمێنم كە: لەم ڕۆ بەدواوە, ماوەیەك نەماوە بۆ ئاشتی لەگەڵ شەیتانا, دەبێ هەمیشە لەگەڵیا بجەنگێم, چونكە ئەو دوژمنی گەورەی مرۆڤایەتییە, دوژمنی ڕاستەقینەی ئادەمیزادە, چۆن بە گوێی فەرمانەكەی خوا نەكەم؟ كە دەفەرموێ: شەیتان دوژمنی ئێوەیە ئێوەش بە دوژمنی بزانن )؟!

ویستم بەم كارە گەورەترین دەرگا لە شەیتان داخەم, كە لەوێوە هاتوچۆی دەكرد, دەرگای ماڵ و سامان.. بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) نەیهێشت هەموو سامانەكەم بكەم بە خێر چونكە حونەری نییە توانای شتێكت نەبێ و خۆتی لێ بپارێزی.. حونەری ئەوەیە دەسەڵات و توانای ستەم كردنت هەبێ و خۆتی لێ بپارێزی, ئا ئارەزووی جینسیت بەهێز بێ و خێزانت نەبێ و توانا و جوانیت هەبێ خۆت لە زینا بپارێزی..

حونەر لەوەدایە من ماڵ و سامانم هەبێ و شەیتان نەتوانێ بە سەرما زاڵ ببێت.

لە ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (وا چاکترە هەندێ لە ماڵ و سامانەکەت گل بدەیتەوە بۆ خۆت).

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەگەر فەرمانت نەکردایە بە: گل دانەوەی هەندێ ماڵ و سامانم، دەم ویست هەمووی بکەم بە خێر.. بەڵام لەبەر فەرمانەکە تۆ، تەنیا ئەو بەشە دێڵمەوە، کە لە دەست کەوتی (خەیبەر) دا بەرم کەوتووە.

ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) قایل بوو. پاش ئەوە دەست نایە ژێر چەناکەم و بیرم لەوە دەکردەوە مەرجێکی تریش بۆ خۆم دانێم، زیاد لە واز هێنانی باخ و سامانەکەم.. سەرم بەرز کردەوە و گوتم: ئەی پیغەمبەری خوا (ﷺ)، تەنیا بە هۆی ڕاستییەوە بوو خوا منی ڕزگار کرد منیش بڕیار بێ تا ماوم ڕاستگۆ بم و بە هیچ جۆر درۆ نەکەم..

١٨

بەڵێ، ڕۆژگار دەڕۆیشت و منیش لەسەر بەڵێن و پەیمانی خۆم بەردەوام بووم وەڵلاهی پێ نازانم خوا بە هۆی ڕاستییەوە هیچ کەسێکی تووش کردبێ، ئەوەندەی ئەو تووش کردنەوەی من تووش بوم باش بووبێ، کە لە بەردەم پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ڕاستم کرد و بە درۆ خۆم ڕزگار نەکرد..

باوەڕت هەبێ پاش نیعمەتی ئیسلام، هیچ ناز و نیعمەتێکی ترم بەقەد ئەو ڕاست گۆییە لا گەورە نییە.. جا بەس نەبوو لای پێغەمبەر (ﷺ) درۆم نەکرد، وە لەگەڵ موونافیق و دووڕووەکاندا بەر خەشمی خوا نەکەوتم، ئەوانەی ئەم ئایەتە لە بارەیانەوە هات:

(کاتێ گەڕانەوە بۆ لایان، سوێندتان، (بەخوا) بۆ دەخۆن تا وازیان لێ بێنن ئێوە وازیان لێ بێنن، چونکە بە ڕاستی ئەوانە ناپاکن، وە مەڵبەند و جێگەی پاشە ڕۆژیان دۆزخە و لە پاداشتی کردەوەکانیانا، سوێندتان بۆ دەخۆن تا لێیان ڕازی

بن, ئەگەر ئێوەش لێیان ڕازی بن, بێ گومان خوا ڕازی نابێت لە كۆمەڵی فاسقان ) – ئەوانەی لە حەق لایان داوە و كافر بوون – ) [1]

بە خوا لەو ڕۆژەوە ئەو پەیمانەم داوە بە پێغەمبەر(ﷺ) هیچ درۆیەكم نەكردووە و هیوام وایە تا دەمرم خوا لە درۆ بم پارێزێ..

برایان, ئەم زیندانەی من هەرچەند تاریك بوو, ئای چەند جوان بوو ! چونكە لەگەڵ تاڵاییەكەیا دەوابوو..

ئەم زیندانەی من هەرچەند ئەشكەنجە و ئازاری زۆر بوو, بەڵام چارەسەر بوو..

ئای برایان, ئەم ئایینی ئیسلامە چەند شكۆمەندە !! چونكە هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدات

---

١- ئەمە مەعنای ئەم ئایەتانەیە لە سوورەتی (التوبه) دا, ﴿سَيَحْلِفُونَ بِاللّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْ فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاء بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ, يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِن تَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾ التوبه: ٩٥, ٩٦.

دەروونـەکان پـاك و خـاوێن بکاتـەوە پـێش ئـەوەی بناغەی قەلاّ ڕێك و پێکەکەی دابمەزرێنێ..

هیـوادارم ئێـوەش لـەم بەسـەر هاتەی مـن سـوود وەرگرن، ئیتر بە خواتان دەسپێرم، و السلام علیکم و رحمة الله.